پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ١٧

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

# شوناس
# و
# ڕەهەندی بەجیهانیبوون



عومەر عەلی موحەممەد

ئەمڕۆ لـە جیهانی ئیسلامییدا گـەڕانەوەیەکـی بەرفراوانـی گەلانـی مسوڵمان دەبینین بۆ شوناسی ئیسلامیی، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیـەوە بتوانن جارێکی تر وێنەیەکی نوێ بۆ خۆیان دروست بکەنەوە.

ڕاپەڕینـە جەماوەرییـەکانی ئەمدواییەش ئەوەیـان سەلمـاند کـە گەلانی مسوڵمان لـە هەوڵی گێڕانەوە و بونیاتنانەوەی سەر لـە نوێی شوناسی ئیسلامیی خۆیاندان ونایانەوێت جارێکی تر ئەم شوناسـە لەسەر بنەمای عەلمانیبوون، فاشیبوون، تاکڕەویی و عەسکەرتـاریی بونیات بنرێت.

هـەڵبژاردنەکانی میسر و تونس و مەغریب و سـەرکـەوتنـی ئیسلامییەکان بە دەنگی خەڵک، ئەو ڕاستیەیان سەلماند کە ئـەم گەلانـە کاتێک داوای دیموکراسی و ئازادی و عەدالـەت دەکـەن، دەیانەوێت ئەم چەمکانە بـە باکگراوندێکی ئیسلامیـی ڕەنگڕێـژ بکەنەوە و کۆتایی بەو قۆناغە بهێنن کە لە ڕێگەی ستەمکارییـەوە دەیانویست شوناسێکی عەلمانیی بۆ ئەم نەتەوانە دروست بکـەن کە هەڵقوڵاوی ئایدیۆلۆژیای لیبراڵی و سۆشیالیستیی بێت.

شوناس و
ڕەهەندی بەجیهانیبوون

مرکز الزهاوي للدراسات الفكرية

المعهد العالمي للفكر الإسلامي ١٧

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

(١٧)

# شوناس و ڕەهەندی بەجیهانیبوون

نووسینی:

عومەر عەلی موحەممەد

ئەم کتێبە بەشی سێهەمی نامەی ماستەری نووسەرە لە بواری کۆمەڵناسیی سیاسییدا، بە ناونیشانی:

(بەجیهانیبوون و کاریگەریی لە سەر شوناسی کولتووریی)

بە سەرپەرشتی دکتۆر صەباح بەرزنجی

چاپی یەکەم

١٤٣٣ ک ٢٠١٢ ز





ناوی کتێب: شوناس و ڕەهەندی بەجیهانیبوون.

نووسینی: عومەر عەلی موحەممەد.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (١٧).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٠٩٤)ی ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٢.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: **iiitkurdistan@yahoo.com**

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

بە وتەی ئەریکسۆن" یەکێك لە گرنگترین قەیرانەکانی ئەم سەردەمە نوێیە کە مرۆڤ تووشی دەبێت، بریتییە لە قەیرانی شوناس، چونکە لەگەڵ پێشکەوتنی جیهان و دەرکەوتنی بەجیهانیبوون، ئیتر زۆربەی دیاردە و فۆرم و شێوازەکانی ژیان گۆڕانیان بەسەردا دێت. لە دوای ئەوە جیهانێك دروست بوو کە زۆر جیاوازە لە جیهانەکەی پێشوو، بە بەردەوامی پێشکەوتنی جیهان و گۆڕانکارییە جیاوازەکان وەك تۆفلەر لە ساڵەکانی نەوەدەکاندا دەیوت، جیهان هەموو حەوت ساڵ جارێك دەگۆڕێت، بەڵام ئێستا دوای ئەو شۆڕشە گەرموگوڕەی زانیاریی و تەکنەلۆژیا، جیهان هەموو ساڵێك و هەموو مانگێك دەگۆڕێت، لەبەر ئەوە ئەو شتانەی کە لای مرۆڤ نەگۆڕ بوون، دەکەونە ژێر فشار و جۆرێك لە کاردانەوە، یان تەسلیمبوون دروست دەکەن.

دیاردەی بەجیهانیبوون دەچێتە ناو هەموو کایەکانی ژیانی مرۆڤەوە، دەست دەخاتە شێوازی بیرکردنەوەی هەموو تاکێك، تەنانەت کاریگەریی دروست دەکات بۆ دیدو تێڕوانینی هەموو مرۆڤەکان و لێرەشەوە خوێندنەوەی نوێ بۆ مێژوو ئابووری و ئاین و رۆشنبیری و.. هتد سەر هەڵدەدات، نەتەوەکان دەکەونە بەردەم واقیعێکی نوێ، کە ئایا چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم دیاردە نوێیەدا بکەن کە پێی دەوترێت بەجیهانیبوون. ئەو نەتەوانەی کە خاوەنی پلان و ستراتیجییەتێکی خۆیانن و لە ناو گۆڕانکارییەکاندا دەژین و خۆیان بەشێکن لەو جیهانە نوێیە، زۆر ناکەونە ژێر فشار و شڵەژانیان پێوە دیار نییە، نموونەی ئەم کۆمەڵگەیانەش یابانی و چینییە.

ئەم دوو کۆمەڵگەیە کە لە رووی شوناسەوە جیاوازن لە کۆمەڵگەی ئەمریکی و ئەورووپیی، لە کاتێکدا کە مامەڵە لەگەڵ دیاردەی بەجیهانیبوون دەکەن، نایەن بیر لە پەراوێزخستنی شوناسی نەتەوەیی و کلتووری و ئاینیان بکەنەوە، بەڵکو تەکنۆلۆژیا و

زانیارییەکان وەردەگرن و جارێکی تـر بـە ڕۆحێکـی یابـانی و چـینیەوە دەیخەنـە ڕوو، بەمـەش دەبیـنین ئـەو دوو کۆمەڵگەیـە سـەرەڕای پێـشکەوتنیان لـە بـواری شۆڕشـی زانیاری و ژمارەییدا، بەڵام توانیویانە پارێزگاری لە شوناسی خۆیان بکەن و لـە هـەمان کاتدا وێنەی تەکنۆلۆژیاکەش جۆرێك لە شوناسی نیشتمانی و نەتەوەیی پێ بدەن.

بــەڵام لێــرەدا ئــەوەی ئێمــە دەمانــەوێت لەســەری بووەســتین، کۆمەڵگــە دواکــەوتووەکان و نەتــەوە موســڵمانەکانن، چـونکە خراپیــی بــارودۆخی ژیــان لــەم کۆمەڵگایانـەدا و دواکـەوتوویی لـە ڕووی ئـابووری و سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەوە، وای کـردووە مرۆڤـی ئـەم کۆمەڵگەیانـە بـەردەوام کەسـایەتییەکی شکـستخواردوویان بـۆ دروست ببێت، لەبەر ئەوە تاکی ئەم کۆمەڵگەیانە تاکێکە هەست بـە بـوون و ئـیرادە و گەورەیی خۆی ناکات، بەردەوام خۆی وەك کەسێکی بێتوانـا و دواکـەوتوو دێتـە پـێش چاو و ئەوانی تریش بە پێشکەوتوو شارستانی و مەدەنیی، ژینگـەی دواکـەوتووی ئـەم کۆمەڵگەیانـە و دوورییـان لـە ڕووی شارسـتانی و بەشـدارییەنەکردنیان لـە گۆڕانکارییـە جیهانییەکانــدا، وای لێکــردوون کــە گومــان لــە خۆیــان و لــە شــوناس و ئــایین و شارستانیەتەکەیان بۆ دروست ببێت.

فرانس فانون لە وتەیەکیدا دەڵێت ڕەشپێستەکان بەردەوام خـەو بـەوەوە دەبیـنن کە ڕۆژێك پێستیان سپی بوایە. ئێستا لە ژێر ڕۆشـنایی ئـەو بۆچـوونەدا قژڕەشـەکان و چاوە ڕەشەکانیش هەمان هەستیان بۆ دروست بووە، کە بـەردەوام لـە بـەردەم چـاوی شـین و قـژی زەرددا خۆیـان بـە کـەمتر دەزانـن، لەبـەر ئـەوە بـە هـەر هۆکارێـك بـووە دەیانەوێت ڕەنگی چاو و قژیان بگۆڕن و وەك ئەوانی لێ بکەن.

بارودۆخی دواکەوتووی کۆمەڵگەی کوردیی وایکردووە کە تاکی کورد هەست نەکات شوناســێکی هەیــە، بــۆ ئــەم مەبەســتەش لەســەر ئاســتێکی گــشتیی حکومــەت و ڕۆشنبیرانیش پرۆژەیەك لە ئارادا نییە، بەڵکو بەردەوام کۆمەڵێك ڕۆشنبیر هەن کە کـار لەسەر لاوازکردنی شوناس دەکەن و ڕەخنە لە پێگە بە هێزەکان دەگـرن و نـاتوانن بـۆ ئایندەش پێشنیاری شوناسێکی باشتر بکەن. دەتوانی قەیرانی شوناس لـە کۆمەڵگـەی

کوردییدا لە ڕێگەی هەڵوێستی گەنجان بەرامبەر ئاین و نیشتمان و نەتەوە ببینی. کە زۆربەیان بە ڕەشبینییەوە سەیری ئەم بوارە دەکەن و دڵخۆشییەکیان بۆ ئایندە تیادا نابینرێ.

راستە ئەمە بەشێکی کاردانەوەی ئەو واقیعە سیاسییەیە کە لە ئارادایە، بەوەی کە وەك فارابی دەڵێت ئەو بەشدارییەکی لە نیشتماندا نییە هەتا خۆشی بوێت. چونکە بۆئەوەی هەموومان نیشتمانمان خۆش بوێت، دەبێت موڵکی هەموومان بێت، نەك لە لایەن کەمینەیەکەوە دەستی بەسەردا بگیرێت و زۆرینە لێی بێبەش بن.

شوناس بەردەوام پێویستی بە بنیاتنانەوە و ریفۆرم و تازەگەریی هەیە، بۆئەوەی ئەم شوناسە ڕەنگدانەوەی واقیعی ئێستای جیهان بێت و هەموو لایەك پارێزگاری لە کلتووریی و ڕەسەنایەتی نیشتمان و نەتەوەیی بکەن. لە لایەکی تریشەوە لە پێشکەوتنە جیهانییەکە دوا نەکەون و نەتەوەیەکی زیندوو بن لە بواری گەشەپێداندا.

لەم سەردەمەدا کە بە سەردەمی بەجیهانیبوون ناسراوە، شوناسی نەتەوەکان لە هەموو کاتێك زیاتر بەرەوڕووی بارودۆخێکی نوێ دەبنەوە، کە ئایا دەتوانن لە بەرامبەر ئەوەی پێی دەوترێت شوناسی جیهانیی خۆیان بگرن، یان تووشی قەیران و توانەوە دەبن و هەرەس دەهێنن؟ ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت شوناسی جیهانیی لە راستیدا شوناسی جیهانیی نییە کە لەسەر بنەمای پەیڤین و لەیەکتر تێگەیشتنێکی جیهانیی دروست بوو بێت، بەڵکو شوناسێکی لۆکاڵیی ڕۆژئاوایە بەتایبەتیش ئەمریکا، کە وێنای خۆی دەکاتەوە لە قاڵبێکی جیهانییدا و دەیەوێت باز بەسەر هەموو شوناسەکانی تردا بدات، ئەم شوناسە نوێیە پێگەیەك ناهێڵێتەوە بۆ شوناسەکانی تر و هەریەکەیان بە جۆرێك لە ناکامڵبوون و بەربەری و ناشارستانی و سەرەتایی لە قەڵەم دەدات و لە بەرامبەریشدا شوناسە ڕۆژئاواییەکە دەکاتە سەرچاوەی ئیلهامی پێشکەوتن و شارستانیەت و گەشەپێدان، لەبەر ئەوەش کە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا پشتئەستوورە بە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی و سەربازی و ئابووریی، زۆرجار دێت و لە ڕێگەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و بانکی نێودەوڵەتی و بانکی بازرگانیی جیهانیی

ئەو مەرجە کولتوورییانە دەسەپێنێت بەسەر وڵاتە دواکەوتووەکاندا، کە دواجار بە قازانجی کلتوور و شوناسی باڵای رۆژئاوا بێت. هەر بۆ ئەم مەبەستەش دەبینین تەنانەت لە کاتی قەیرانە سیاسییەکان و هاتنەناوەوەی رێکخراوە رۆژئاواییەکان بۆ وڵاتانی باشوور، بەگشتی بەشێك لە پرۆگرامەکانیان لە گەشەپێدانی مەدەنیەت و دیموکراسی و باری ئابووریی، کارکردنە لەسەر جەختکردنەوە لەسەر گەشەپێدانی کلتوور و شوناسی رۆژئاوا و لەم رێگەیەشەوە دەیانەوێت ئەوە بڵێن کە کلتووری ئەم نەتەوانە سەرچاوەی شەڕ و توندوتیژی و دواکەوتنەکانن و بەبێ وازهێنان لەو کلتوورانە پێشکەوتن روو نادات.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەوڵانەش کە لە ئارادان بۆ سڕینەوە و بەرەوڕووبوونەوە و دروستکردنی قەیران بۆ شوناسە تایبەتمەند و لۆکاڵەکان، لە هەمان کاتدا ئێستا لە ئاسیا و جیهانی ئیسلامیی و ئەمریکای لاتین و ئەفریقیاشدا، بزاڤێکی نوێ سەری هەڵداوە و وەك جۆرێك لە رابوونێکی کلتوری دەردەکەوێت،ئەویش لە بەرامبەر ئەو مەترسیینەی کە کلتوورێکی جیهانیی دەیەوێت لە بەرامبەر کلتوورە لۆکاڵییەکاندا ئەنجامی بدات، بەمەش هەست دەکرێت کە شەپۆلێکی نوێی گەڕانەوە و بنیاتنانەوەی شوناس دەستی پێکردووە. ئەم رووبەڕووبوونەوەیە تەنانەت ئەورووپاشی گرتۆتەوە دژ بە ئەمریکا و نایانەوێت نەوەی نوێیان لەسەر فیلمەکانی هۆلیوود و راگەیاندنی نوێی ئەمریگا گەورە بن، لە یابانیشدا شوناسێکی تایبەتمەند دەبینین کە پارێزگاری لە تایبەتمەندییەکانی خۆی دەکات و وێنەیەکی نوێ دەداتەوە بە شوناس لە پاڵ پێشکەوتنی شۆڕشی زانیاری و تەکنۆلۆژییدا، بەمەش دەیەوێت رەسەنایەتی کلتووری نەتەوەی یابانیی لە بەردەم شاڵاوە جیهانییە نوێیەکەدا بپارێزێت.

لە جیهانی ئیسلامییشدا گەڕانەوەیەکی بەرفراوانی گەلانی موسڵمان دەبینین بۆ شوناسی ئیسلامیی و بۆئەوەی لەم رێگەیەوە بتوانن جارێکی تر وێنەیەکی نوێ بۆ خۆیان دروست بکەنەوە، کە ئەویش پشتبەستنە بە کلتووری دەوڵەمەندی شارستانیی

خۆیان، بۆ وەستانەوە بە رووی هەر هەوڵێك کە دەدرێت بۆ سڕینەوەی کلتووری ئیسلامیی.

راپەڕینە جەماوەرییەکانی ئەم دواییەش لە جیهانی ئیسلامییدا ئەوەیان سەلماند کە گەلانی موسڵمان لە هەوڵی گێڕانەوە و بنیاتنانەوەی سەر لە نوێ شوناسی ئیسلامیی خۆیاندان و نایانەوێت کە ئەم شوناسە لەسەر بنەمای عەلمانیبوون، یان فاشیبوون و تاکڕەوی و عەسکەرتاریی بنیات بنرێت و لەگەڵ داواکانیان بۆ ئازادی و دیموکراسی، لە روویەکی تریشەوە دەیانەوێت پارێزگاری لە شوناسی شارستانی و ئاینیی خۆشیان بکەن، ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی میسر و تونس و مەغریب و سەرکەوتنی ئیسلامییەکان بە دەنگی خەڵك، ئەو راستیەی سەلماند کە ئەم گەلانە کاتێك داوای دیموکراسی و ئازادی و عەدالەت دەکەن، دەیانەوێت ئەم چەمکانە بە باکگراوندێکی ئیسلامیی رەنگڕێژ بکەنەوە و کۆتایی بەو قۆناغە بهێنن کە لە رێگەی ستەمکارییەوە دەیانویست شوناسێکی عەلمانیی بۆ ئەم نەتەوانە دروست بکەن کە هەڵقولاوی ئایدۆلۆژیای لیبراڵی و سۆشیالیستیی بێت.

**نووسەر**

**٢٠١٢/١/٢٣**

# بەشی یەکەم:
# شوناس لەنێوان لۆکاڵیبوون و بەجیهانیبووندا

شوناس پێناسەی جۆراوجۆری هەیە و هەریەکە بە جۆرێك دید و تێڕوانینی خۆی لە بارەیەوە دەخاتە روو، هەندێك لەو بڕوایەدان کە وشەی شوناس فیکرەیەکی ستاتیکی لە نێو خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە تەعبیر لە جەوهەری شتەکان دەکات، کە لەناو نەچن و نەگۆڕێن، یان دەتوانین بە جۆرێکی تر بڵێین هەڵگری چەند رەگەزێکی نەگۆڕە، واتە تەعبیرکردنە لە (کرۆکی شتەکان) لە رووی دیاریکردن و تایبەتمەندبوون و یەکجۆرییەوە[1]، واتە بریتییە لە کۆمەڵێك سیما و ئاکار و بەهای کۆمەڵایەتیی هاوبەش لە ڕووی سایکۆلۆژیی و کولتووری و کۆمەڵایەتی و رۆحی و شارستانییەوە. لە زانستی کۆمەڵناسیدا دەتوانین بە شتێکی سایکۆلۆژیی، یان سلوکی گشتی کۆمەڵ ناوی بەرین و ئەم سیفات و ئیحایانەش لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر گۆڕانیان بەسەردا دێت، چونکە شوناس دەگۆڕێت، بە گۆڕانی کات و شوێن.

هەموو گەلێك ژینگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە تیایدا دەژی، ژینگە بریتییە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە کار لە سلوکی تاك دەکەن لە ڕووی پێکهاتەی سایکۆلۆژی و شێوازی بیرکردنەوەیدا.

لە نێو هەر گەلێکدا سێ ئاست لە شوناسی کولتووریی هەیە: شوناسی تاك، شوناسی کۆمەڵ، شوناسی نیشتمان یان نەتەوەیی، پەیوەندیی نێوان ئەم ئاستانە چەسپاویی نییە، بەڵکو لە حاڵەتێکی هەڵکشان و داکشانی بەردەوامدایە، بواری هەریەکەیان دەگۆڕێت بە ئاڕاستەی فراوانبوون، یان بەرتەسکبوونەوە.

---

[1] سليمان تقي الدين، تحولات المجتمع والسياسة، أفكار عن عالم جديد، دار الحداثة، بيروت، ط۱، ۱۹۹۲، ص٦٦.

ئەویش بەپێی بارودۆخ و جۆرەکانی بوونی ململانێ، یان نەبوونی، یان یەکگرتن و هاریکاریی، یان نەبوونی جوڵێنەرێك دەگۆڕێت، ئەمەش بەرژەوەندیی تاك، یان کۆمەڵ، یان بەرژەوەندیی نیشتمانی و نەتەوەیی دیاریی دەکات.[2]

شوناس مەرجێکی بنەڕەتی و پێویستە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و بەبێ بوونی چوارچێوەیەکی دیاریکراو بۆ شوناسی کۆمەڵایەتی مرۆڤ ناتوانێت بە ژیانێکی ئامانجدار بژی و ناشتوانێت پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی تەندروست لەگەڵ ئەوانی تردا بنیات بنێت، لەواقیعدا هیچ کۆمەڵگەیەك نییە بەبێ بوونی شوناسێکی بەکۆمەڵ،[3] بەڵام ئەم چەمکە لەم زەمەنە نوێیەدا، دەکەوێتە بەردەم شەپۆلێکی نوێ لە گۆڕانکاریی، کە جیاوازە لەو بارودۆخەی کە لە سەدەکانی پێشوودا هەبووە، چونکە کولتوور دابڕاو نییە لە گۆڕانکارییەکان و بە جۆرێك لە جۆرەکان گۆڕانی بەسەردا دێت، کولتوور بەرهەمی ماددی و مەعنەویی مرۆڤە و بە گۆڕانی سلوك و بیرکردنەوەی مرۆڤیش، کولتوورەکەش گۆڕانی بەسەردا دێت، دیوێکی مەترسیدار لە کولتووری بەجیهانیبووندا ئەوەیە، کە هەوڵی سڕینەوە و هەڵوەشانی ڕەمز و کەلەپوور و شارستانییەکانی تر دەدات.

ڕۆژئاوا بۆ ئەوەی سنووری قەڵەمڕەو و کاریگەریی کولتوورە تایبەتییەکەی خۆی زیاد بکات، لەبەر ئەوە بەردەوام وای لەقەڵەم دەدا، کە کولتووری ئەو تازە و مۆدێرنیزم و پێشکەوتووخوازە و کولتوورەکانی تر دواکەوتوون، لێرەشەوە سووکایەتی و بێزێزکردن و هەڵوەشانی مێژوو و کولتوور و شارستانییەکانی تر بەتایبەتی لەبەردەم نەوەی نوێدا، ئامانجێکی سەرەکیی ئەم کولتوورە نوێیەیە، کە دەیەوێت بیانکات بە پاشکۆی خۆی و وێنەی جۆرێکی تر لە شوناسیان بۆ دروست دەکات کە پێی دەڵێن شوناسی جیهانیی، کە بەپێی ئامانجەکانی خۆی هەوڵی

---

[2] محمد عابد الجابري، العولمة و الهوية الثقافية، عشر أطروحات، لە کتێبی (العرب و العولمة )، ص٢٩٨-٢٩٩.

[3] أحمد گول محمدی، جهانی شودن فرهنگ، هویت، تهران، انتشارات نشونی، ل ٢٤٨.

بنیاتنانی مرۆڤێکی جیهانیی دەدات، ئەم شوناسە نوێیە مرۆڤێکی بەکاربەر و پاشکۆیە بۆ ئەم شوناس و کولتوورە نوێیە.

یەکێك لە گرنگترین پێداگرتنەکانی سەردەمی بەجیهانیبوون بریتییە لە گەشەدان بە هەژموونی کولتووری ڕۆژئاوایی لەسەر حسابی کولتوورە ئاینی و لۆکاڵی و نەتەوەییەکان، ئەم کولتوورە نوێیە خاوەنی (زانیارییەکان) و هەموو هۆکاری پێویستە لە ڕووی سیاسی و ئابووری و تەکنیکییەوە، لەپێناو چەسپاندنی ئامانج و چەمکەکانی سەردەمی بەجیهانیبوون.[٤]

مەترسییەکانی بەجیهانیبوون لەسەر شوناسی کولتووریی سەرەتایەکە بۆ مەترسییەکی گەورەترلەسەر دەوڵەت و سەربەخۆیی نیشتمانی و بەڕێوەبردنی نیشتمان و کولتووری نیشتمانی، واتا بەجیهانیبوون دەبێتە هۆی پاشکۆیەتی زۆرتری کەنارەکان بۆ سەنتەر، یەکگرتن و کۆکردنەوەی هێزەکانی سەنتەر و هەڵوەشاندنەوەی هێزەکانی کەنار، لە نێو ئەوانیشدا دەوڵەتی نیشتیمانیی[٥].

هەر بە ناوی کولتوورەوە، کولتوورە لۆکاڵی و تایبەتییەکان دەکەونە بەر لەقاڵبدان لە کولتووری ناوەنددا، واتە دەتوانین بڵێین کە چەمکی (acculturation) بە جۆرێکی سلبی کەڵکی لێ وەردەگیرێ کە مانای لەناوبردنی کولتوورێك دەگەیەنێت لەپێناو کولتوورێکی تردا، واتە قووتدانی کولتوورێکی کەنار لەلایەن سەنتەرەوە، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر چەمکی تر بەکاردەبرێن، وەك پێکدادانی شارستانی، یان پەیڤینی شارستانییەکان، یان ئاڵوگۆڕی کولتووریی، بە کورتی ئەم چەمکانە ئەوە دەگەیەنن کە کولتووری سەنتەر بریتییە لە کولتووری باو و باڵادەست کە خۆی لە کولتووری جیهاندا دەبینێتەوە، پێویستە هەموو کولتوورەکان چاویان لێ بکەن و شوێنی بکەون.[٦]

---

[٤] د. أحمد البغدادي، أزمة الفكر الاسلامي في عصر العولمة، مجلة النهج، مركز الابحاث والدراسات الاشتراكية في الوطن العربي، دمشق، ص١٦.

[٥] د. حسن حنفي، د. جلال العظم، ما العولمة. دار الفكر، دمشق، ٢٠٠٠، ص٥.

[٦] هەمان سەرچاوە، ل٥٣- ٥٤.

## شوناس و تایبەتمەندی کولتووری:

لەوانەیە بڵێین ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی عەرەبی و ئیسلامیی نییە کە باس و لێکۆڵینەوەی لەسەر دیاردەی بەجیهانیبوون و کاردانەوەکانی نەکردبێت لەسەر شوناسی نەتەوەیی و شارستانی، لەهەمان کاتدا دەیەها کۆڕ و سیمینار گیراون لە گۆڕەپانی عەرەبیدا کە باس لەم دیاردەیە دەکەن بە هەمان ژێربێژی و بە هەمان مەرجەعیەتەوە.[(٧)]

ئەم دیاردەیە ئێستاشی لەگەڵدا بێت کەمتر بووەتە باس و خواسی میدیا و ئەکادیمیای کوردیی، چونکە گەلی کوردستان قەیرانی لەپێشتری هەیە و کەمتر ئەو بابەتە بووەتە جێگەی سەرنجی سیاسی و ڕۆشنبیران و ڕۆژنامەنووسان، لەلایەك گرفتی شوناسی سیاسیی هەیە، لەلایەکی تریشەوە گەندەڵی شۆڕ بووەتەوە بە ناو هەناوی کۆمەڵگەی کوردیدا و لێرەوە خەڵك پرسیاری مافە سەرەتاییەکانی هەیە نەك باس لە قەیرانی شوناس و خوێندنەوەی ئایندەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بە کۆمەڵگەی جیهانییەوە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەیری خوێندنەوەی زۆرینەی نووسەر و ڕۆژنامەنووس و بڵاوکراوەکان بکەین لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییدا، بە پلەی یەك ناتوانن شتێك بنووسن کە پێچەوانەی ئاڕاستەی سیاسەتی دەوڵەتی مەرکەزیی بێت، دەوڵەتانی ئەم ناوچەیەش لەوە دەرناچن کە دەوڵەتێکی تاکڕەوی عەسکەرتارین، یان دەوڵەتی شانشین و بنەماڵەن، ئەگەر جۆرێك لە دیموکراسییەتیش هەبێت هەر لە خزمەت ئەو جۆرە دەسەڵاتانەدایە و هەرگیز لە خزمەت گۆڕانی ڕیشەیی و چەسپاندنی عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا نییە، لەبەر ئەوە کاتێك سەیری هەڵوێستی ئەو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانەش دەکەین، نووسینەکانیان بە ئاڕاستەیەك دەنووسن لە خزمەت مانەوەی دەسەڵاتی سیاسیدا بێت وەك کە ئێستا هەیە، لەبەرئەوە دەبینین کاتێك کە باس لە کاریگەرییەکانی بەجیهانیبوون دەکرێت لەسەر شوناس و کولتوور، ئەمە بە

٧ د. سيد وليد اباه، إتجاهات العولمة، المركز الثقافي العربى، الدار البيضاء، ٢٠٠١، ص٥١.

مەترسـییەکی گـەورەی لـە قەڵـەم دەدەن و بـە هۆکـارێکی دەزانـن بـۆ توانـەوە و لەناوچـوون، لەبەرامبـەردا مەودایـەك ناهێڵنـەوە بـۆ گفتوگـۆ و لەیەکترگەیـشتن، یـان هەنگاوێك بۆ ڕیفۆرمێکی کولتووریی، چونکە دەوڵەتانی ئـەم ناوچـەیە زۆر لـە ڕیفـۆرمی کولتووری سیاسـیی دەترسـن، لـەم ڕوانگەیـەوە دەبیـنین کـە بـەردەوام سـنوورەکانی ئـازادی و دیموکراسـی کەمدەکەنـەوە، ئـەویش بـە بیـانووی پاراسـتنی شـوناس، یـان یەکێتیی نەتەوەیی، بۆ بەرەوڕووبوونەی دوژمنە دەرەکییەکان.

لەبـەر ئـەوەی ئـەم ڕژێمـە سیاسـییانەش هـیچ بەرنامەیـەکیان نییـە بـۆ گـۆڕان و گەشـەپێدان، هەوڵـدەدەن بـە هـەمان شـێوازی خۆیـان بمێننـەوە و لەهـەر بانگەشـە و شـەپۆلێکی گـۆڕان دەترسـن و نـاتوانن وەك بزاڤێکـی سیاسـیی بـوونی خۆیـان لـە ڕەهەندێکی ئازاد و دیموکراسیدا بسەلمێنن.

لەلایەکی ترەوە ئێستا کۆمـەڵێك لـە ڕژێـم و حیزبـی سیاسـی کەوتوونەتـە بـەردەم پرسـیار و لێپرسـینەوەی شـێلگیرانەی گـەل و نەتـەوەکانیان، چـونکە بەشـێك لەمانـە هەڵگری جیهانبینییەکی سیاسی نین کە هـەڵقوڵاوی کولتـوور و مێـژوو و شارسـتانیەتی گەلەکانیان بن، بەڵکو هەڵگری کۆمەڵێك دروشم و جیهانبینی و سـلوکن، کـە نـامۆن بـە کولتوور و جیهانبینی گشتیی هاوولاتیـان، لێـرەوە لەبـەردەم پرسـیاری شوناسـدا بـێ وەڵامن و ناتوانن ببنـە ئـەو هێـزەی کـە پارێزگـاری لـە سـیماکانی شـوناس و کولتـوور بکەن، بەڵکو زۆر جـار هـەر خۆیـان هۆکـارێکی بـەهێزن لـە لاوازکردنـی ئـەو شـوناس و کولتوورەدا.

ئێستا کە باس لە کولتوور دەکرێت وەك جیاکەرەوەیەکی شوناس وێنا دەکرێـت و دەکرێتە بنەمای پێکهـاتنی کەسـایەتی نەتـەوە، هـەر لێـرەوە باسـکردن لـە پاراسـتنی تایبەتمەنـدیی کولتـوور کراوەتـە هۆکـارێکی تـر بـۆ بـەهێزکردنی پێگـەی شـوناس و پاراستنی لە دەستێوەردانی دەرەکیی.(٨)

---

٨ ادريس هاني، العرب والغرب، ص٨٤.

بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییە بزانرێت کە ئەوە دڵسۆزی نییە بۆ شوناسی نەتەوە کە تۆ بە ترسەوە سەیری هەموو گۆڕانکارییە نوێیەکان بکەیت، بەڵکو پێویستە کە بەردەوام تۆ لە فیکری ریفۆرم و خۆگونجاندن و نوێبوونەوەدا بیت، لەلایەکی ترەوە گۆڕانکارییەکان ئێستا بە ئاڕاستەیەکن کە بوارێك نەماوەتەوە بۆ خۆپەراوێزخستن و داخران و خۆگرمۆڵەکردن، چونکە ئەگەر تۆش بتەوێت بەو ئاڕاستەیە هەنگاو هەڵبگری، هۆکارە جیهانییەکان و تۆڕەکانی پەیوەندی بە جۆرێك پێشکەوتوون کە تۆ ناتوانی ڕێگەیان لێ بگری. ئەمڕۆ هێزی مەعریفە باڵادەستە و گۆڕەپانی ئەویش فەزای سیبرنێتی و گەردەکانی بۆشایی ئاسمانە، کە سنوورەکان بەبێ پرس دەبڕێت و سەرەڕای داخستنی دەرگا و پەنجەرەکان لەگەڵ هەوادا خۆ بە ژوورەکاندا دەکات و لە ڕێگەی شاشە جۆربەجۆرەکانەوە خۆی لەبەردەم تۆدا نمایش دەکات و قسەت بۆ دەکات و زانیاریت دەداتێ، لەبەر ئەوە هەموو نەتەوە و ئاینە جۆربەجۆرەکان دەبێت بە ناچاری گوێ لە گوتاری بەجیهانیبوون بگرن و مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

لەبەر ئەوە نەتەوە زیندووەکان لە کرانەوە و بەجیهانیبوون ناترسن، بەڵکو بە بەرنامە و عەقڵیەتێکی نوێوە مامەڵە دەکەن و دەچنە نێو تۆڕەکانی زانیاری و شۆڕشی بەجیهانیبوونەوە، کە هەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووریی دەگرێتەوە.

(بەپێی سروشتی ئەو کارەی کە ئێستا هەیە ئەو نموونەی دەوڵەت و گەلانە تووشی لاوازی و پاشەکشە دەبێت، ئەویش بە هۆکاری بابەتی، کە ئەوەش بەرئەنجامێکی مامەڵەیە لەگەڵ بەجیهانیبووندا، کە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی تایبەتمەندییە نیشتمانییەکان و سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی)[٩].

ترسی وڵاتانی ئیسلامیی لە دیاردەی بەجیهانیبوون، ناگەڕێتەوە بۆ بەهێزیی بەرامبەر لە ڕووی مەعریفە و باڵادەستیی بەها مرۆییەکان، بەڵکو بەشێوەیەکی تایبەتی سەرچاوەی گرتووە لە کۆمەڵێك پێکهاتە و تایبەتمەندیی ئەو ڕژێمە سیاسیيانەی کە

---

[٩] د. سيد وليد اباه، إتجاهات العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢.

لەم ناوچەیەدا باڵادەستن، چونکە خۆیان دەزانن خاوەنی چ پرۆژەیەکن و بەرنامـەکانی پەرەپێدانی مرۆیی لەم کۆمەڵگایانەدا تا چەند لـە گەشـەکردن و بـەرەو پێشـچووندایە، هەتا ئێستاش ئەم کۆمەڵگایانە لە ڕیزی کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندان و خراپی گوزەرانی بـاری ئـابووری جیاکەرەوەیـەکی دیـارە لـەم ناوچـەیەدا، سـەرەڕای بڵاوبوونـەوەی گەندەڵیی ئابووری و سیاسی و کارگێڕیی، کە جەسـتەی نەتـەوەکانی داڕزانـدووە، بـەم هۆکارانەشـەوە نەتـەوەکانی ئـەم ناوچـەیە کۆمـەڵێك گـەلی بێـئیرادەی دواکـەوتوو و بێتوانایان لێ دروست بووە، کە تەنیا خەمیان بژێوی ژیانی ڕۆژانەیە. لەبەر ئەوە ئـەوان لەبەردەم شاڵاوی بەجیهانیبوون و ململانێی شارستانییەکان هەڵوێستێکیان نییـە و بـۆ ئەوان هیچ مانایەکی نییە.

سەنتەری هێز لەم وڵاتانەدا تەنها هێزی بازوو و سەربازییە، کە ئامانجی یەکـەمیان پاراستنی دەسەڵات و کەمینەی حوکم بەدەستەکانە. ئەم هێزە تەقلیدییەش بۆ دنیـای ئێستا مانایەکی نییـە، چـونکە ئـەمڕۆ مانـا و تێگەیـشتنەکان بـۆ سیاسـەت و دەوڵـەت گۆڕاون و تەنانەت چەمکی مانەوەش بە هۆکارە تەقلیدییـەکانی وەك هێـزی زەمینـی و ئاسمـانی ناکرێـت و تەنانـەت بنکـە ئەتۆمییـەکانیش نـەیانتوانی یـەکێتی سـۆڤیەت و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە هەرەس و تیاچوون بپارێزن.

موحەممـەد مـەحفوز وای دەبینێـت کـە ئـەمڕۆ پێـشکەوتنی زانـست لـە ڕووی تەکنەلۆژیا و تەکنیکی نوێ لەسەر ئاستێکی بەرز چۆتە نێو هـەموو بوارەکـانی ژیـان و بووەتە بەشێك لە شوناسی نیشتمانی گەلان.

قسەکردن لەسەر چارەنووسی شوناس و کولتوورە لۆکاڵییەکان ئێستا ڕەهەنـدێکی فراوانی وەرگرتووە و تەنها خەمی گەلانی موسڵمان نییە. لـەم بارەیـەوە سـەید یاسـین دەڵێت:

(بەرەوڕووبوونەوەکانی شوناس و ئـەو ئیـشکالیەتەی کـە دروسـتی کـردووە تـەنها تایبەت نییە بە وڵاتانی عەرەبی کە بەرەوڕووی ببنەوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین گرفتێکی کولتووری و سیاسی و جیهانییە کە مـشتومڕێکی زۆری لەسـەرەو شـەڕێکی سیاسـی و

فیکریـــی خـــستۆتەوە لـــە هـــەموو ولاّتـــانی پێـــشکەوتوو و گەشەســـەندوو، یـــان دواکەوتوودا).[10]

لە ولاّتانی باشووردا زۆرتر گەلانی موسڵمان هەست بەم مەترسییە دەکەن، چـونکە سـەنتەری بـەجیهانیبوون لـە ڕۆژئـاوادا گیرسـاوەتەوە و بەتایبـەتیش لـە ئـەمریکادا، ئێستاش ئەمریکا بووەتە سەنتەری سیاسەت و ئابووری لە جیهاندا، لـە ژێـر ئـەم بـارە نایەکسانییە دژوارەدا کە بـەردەوام تێڕوانینێکـی گومانـاوی هەیـە بـۆ بەرامبـەر، لەبـەر ئەوە سایکۆلۆژیای کولتووری ئەم گەلانە لـەبارێکی ئاسـاییدا نییـە و هەسـت بـە تـرس دەکەن، لە چارەنووسی شوناسەکەیان، ئەو هەست بە ترس کردنـە لـەوەوە سەرچـاوە دەگرێـت کـە ڕۆژبـەڕۆژ مـاوەی نێـوان بـاکوور و باشـوور لەزیادبووندایـە و هەسـت بـە دوورکەوتنـەوەی زیـاتر دەکـەین، واتـە لەلایـەك جیهـان دەبێـتە گونـدێك، بـەلاّم لـەو گوندەدا بەهەشت و دۆزەخێك هەیە بۆ ژیان، باکوور جیهانێکی پڕچەکە بە سـەروەت و سامانێکی زۆر و شۆڕشی زانیاریی پێشکەوتوو، هەروەها هێزێکی سەربازیی بالاّدەست، بەلاّم لە هەمان کاتدا باشـوورێکی دواکـەوتوو و پـەراوێز و کـەمخێر هەیـە، کـە ئەمـەش نزیکی سێیەکی دانیشتوانی جیهان دەگرێتەوە.

ولاّتـانی ئیـسلامیی و ولاّتـانی عـەرەبی و کوردسـتانیش بەشـێکن لـەم جیهانـە، جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێت لە نێوان باکوور و باشووردا، ئەم جیاوازییەش زۆربـەی بوارەکـانی ژیـان دەگرێتـەوە، لـە ڕووی ئابوورییـەوە بـاکوور بـەردەوام لـە گەشـە و بەرەوپێشچووندایە، تەنانەت بە جۆرێکی لێهاتووە کە باس لە ئابووری دەکرێت وێنـەی ڕۆژئـاوا دێتـە پـێش چـاو، لەبەرامبەریـشدا ئەگـەر گەشـەیەکی ئـابووریی هـەبێت لـە باشووردا، ئەوا لە بەرامبەر کێبڕکێی کۆمپانیا و بازاڕەکانی ئەواندا شکستی پێدەدرێت و نـاهێڵن گەشـە بکـات، نموونـەشمان شکـستپێهێنانی ئـابووریی باشـووری ڕۆژهـەلاّتی ئاسیا بوو لە ساڵی (١٩٩٧)، ئـەویش بـە پلانـی سـەرمایەدارێکی ئـەمریکایی بـە نـاوی

[10] السيد ياسين، إعادة إقتراع السياسة من الحداثة الى العولمة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ط١، ٢٠٠٦ القاهرة، ص١٥٢.

(سوروس)، کە ئەمەش بووە هۆی شکستی پرۆژە ئابوورییەکانیان و لە گۆڕانی خەونی پڵنگەکانی تامیل، لە هەمان کاتدا ئێستا پلانێکی بەرچاو هەیە بۆ شکستپێهێنانی ئابووری وڵاتانی ئەفریقی و ئەمریکای لاتین، کە ئەمەش بووەتە هۆی زۆربوونی برسێتی و هەژاری و نەخۆشی و پیسبوونی ژینگە و نائارامی سیاسی لەم وڵاتانەدا، ئەم هەوڵە نوێیانەی ڕۆژئاوا لە کۆتاییەکانی سەدەی رابردووەوە بەڕوونی دەبینرێن، ئەویش بە مەبەستی زاڵکردنی هەژموونی ڕۆژئاوا بەسەر هەموو لایەنەکانی تری ژیانی گەلانی ناڕۆژئاوایی، بە تایبەتیش لە رووی کولتوورییەوە کە پەیوەستە بە هەموو لا یەنەکانی ترەوە، بەتایبەتیش ئابووری و سەروەریی نیشتمانی کە بە تایبەتمەندیی کولتووری تەعبیری لێ دەکرێت، لێرەوە دەبینین کە پرۆژەیەکی گەردوونی هەیە بووەتە سەرچاوەی بەرهەمهێنان، بەتایبەتی لە بواری کولتووردا، لەبەرامبەریشدا دەبێت گەلانی ڕۆژئاوایی بەرهەمهێنەر بن لە بواری کولتووردا، وەك هەموو بوارەکانی تر.

(پرۆژەی کولتووری ڕۆژئاوایی، ئێستا بووەتە ستراتیژیەتی کولتووری بەجیهانیبوون، تەنانەت بوارەکانی تری بەجیهانیکردن لە هەموو لایەنەکانی سیاسی و ئابووری و بازرگانی، ئێستا لە خزمەت پرۆژە کولتوورییەکەیدان، لەبەر ئەوەش کە ئەم پرۆژەیە خاوەنی ئیمکانیەتێکی بەهێزە، یەکەم مەترسییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کولتووری عەرەبی و ئیسلامیی بە هەموو دامودەزگا و پرۆژەکانیەوە)[11].

هەندێك لە نووسەران بڕوایان وایە کە بەجیهانیبوون لە گەشەیەکی بەردەوامدایە و گۆڕانی بەردەوامیش دروست دەکات، کە هەموو لایەنەکانی بەها و ئەخلاق و سلوك دەگرێتەوە لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا، بەتایبەتیش بۆ ئەوەی بەپێی جیهانبینی ئەمریکی پەروەردەیان بکات و کولتووری ئەمریکایی بکات بە کولتووری گەنجانی ئەمڕۆ لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەمەش کاریگەریی لەسەر ئەوە دروست دەکات کە

---

[11] محمد محفوظ، الحضور والمثاقفة، ص١١٤.

سەرکردایەتی ئەم وڵاتانە دەکەوێتــە دەسـتیان و بــەڕێوەی دەبــەن، واتــە ئــەمریکا لــە ئێستاوە دەیەوێت نەوەیەك رابەرایەتی ئەم وڵاتانە بکات، کە ئەمریکاییانە بیربکەنەوە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە بۆچوونێکی تر هەیە کە ئەویش گەشەکردنی بزاڤێکــی نوێیــە لــە گــەنجان کــە بــەرەو ڕووی بــەجیهانیبوون دەوەسـتنەوە، بەتایبــەتیش لــە زانکـۆ و پــەیمانگا ئیـسلامییەکان، ئەمــەش شـتێکی ئاشـکرایە، هــەر لێرەشــەوە هەسـت بــە زیندووبوونەوەیەکی کولتوور و شوناس دەکەین، بەڵام لێرەدا دەبێت ئەوەش بڵێین کـە ئــەم بزاڤــەش بزاڤێکــی تۆکمــە و داڕژاو و خــاوەنی ســتراتیژیەت نییــە. لــەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین، ئەو بێبەرنامەییــە لــە بەرامبــەر کولتـووری بەجیهانیبووندا بەشـێك لــە گەنجان بەرەو توندڕەوی و ناعەقڵانی بـردووە، ڕاسـتە ئێـستا کاردانــەوە هەیــە، بــەڵام پێویستە ئەو کاردانەوەیە بە ئامانج بێت و بەبێ پرۆژەیــەکی پەرەپێـدان نــەبێت، واتــە دەبێت گەنج خاوەنی ستراتیژیەتێکی نــوێ بێــت، بــۆ ئــەوەی کولتــوورێکی نــوێ بنیــات بنێین، واتە لەلایەك پارێزگاری لە شــوناس بکرێـت، لەلایــەکی تریــشەوە لەگــەڵ ڕەوتــە جیهانییەکەدا دابڕان دروست نەبێت و تەکنەلۆژیا و بوارەکانی پــەیوەندی دابــڕاو نــەبێت لە گەنجانی ئەم وڵاتانە.

لێرەوە دەبێت بزانین کە شوناس و تایبەتمەندیی کولتووری، مانای داخران بەسـەر خۆدا و چەسپاوی و نەگۆڕان و دوور لە پێشکەوتن ناگەیەنێت، چونکە ئەگەر ئێمە بــەو شێوەیە بیرکەینەوە تەنها بەرەو دواکەوتوویی و هــەڵوەرین و مـردن دەچـین. شـوناس گیانێکی چەسپاو و نەگۆڕ و هەمیشەیی ناگەیەنێت، واتە شتێك بێت کە شایەنی گـۆڕان نەبێت، یان وا بیربکەینەوە کە ئێمــە ئەمــەمان لــە پێـشینەکانمان وەرگرتــووە و نابێـت بیگــۆڕین و دەبێــت بــە ئەمانەتــەوە بیکــەین بــە ئاکــاری خۆمــان بــێ گــۆڕان و دەستکارییکردن، ئێمە ئەگەر بمانەوێت ئەوەش ئەنجام بدەین، ناتوانین، چونکە گۆڕان شتێکە بەری پێ ناگیرێت، لەبــەر ئــەوە پێویـستە بـزانین چـۆن مامەڵــە لەگــەڵ گۆڕانـدا دەکەین، چونکە ئەوە باشترە نەك بەسەرماندا بسەپێنرێت و ئێمەش لێی بێئاگابین.[١٢]

---

[١٢] ابراهيم جادالله، الثقافة العربية بين الخصوصية والكونية: (WWW. REZGAR.COM).

لێرەوە رۆڵی گرنگی رۆشنبیر دەردەکەوێت، کە دەبێت رابەرایەتی گەلەکەی بکات، بۆ ئەوەی هۆشیارییەکی مەدەنی بە تاکەکان ببەخشێت، بۆ ئەوەی بتوانن لە گۆڕانکارییە نوێیەکان تێبگەن و عەقلانیەت رۆڵ ببینێت لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ بەجیهانیبوون و ڕەهەندەکانی، بەتایبەتی لە بواری کولتوورییدا، لەم ڕووەشەوە پێویستە رۆشنبیر لەسەر هەردوو ئاستی ناوەوە و دەرەوە کار بکات و بتوانێت بە شێوەیەکی واقیعی خوێندنەوەی نوێیان بۆ بکات و ئاڕاستەیەکی نوێ بە بیرکردنەوەی تاك بدات، لەلایەك لە داخران و پەراوێزبوون و بێئاگایی بیپارێزێت، لەلایەکی تریشەوە بتوانێت شوناس گەشە پێبدات و وێنەیەکی نوێ و پێشکەوتووی بۆ دروست بکات.

(رۆشنبیر پێویستە سەرەتا بە رەخنەگرتن لەخۆوە دەست پێبکات، واتە سەرەتا لەگەڵ خۆیدا گفتوگۆ بکات لە بەخۆنازین و لە مێژوو ژیاندا رزگاری بکات و بە عەقڵێکی رەخنەگرانەوە کولتوور و مێژووی خۆی بخوێنێتەوە، بەڵام دەبێت سەرەتا بەو ئامانجە دەست پێبکات کە دەیەوێت ریفۆرم لە کولتووردا بکات، نەك هەرەسی پێ بدا و لەباری بەرێت. واتە لە دەسەڵاتی دروشمەوە رزگاری بکات بۆ بەدیلێکی مەعقول، چونکە خود سەرچاوەی ئازادییە و هەر ئەویشە سەرچاوەی قەیرانەکان)[13].

بەپێی بۆچوونی موحەممەد مەحفوز (پێویستە لەگەڵ هەڕەشەکانی بەجیهانیبووندا بە هۆشیاری و شارستانییەوە مامەڵە بکەین و ئالیەتەکانی لە ژیانی خۆماندا پڕبکەینەوە. بۆ ئەوەی بە مەرجی ژیانەوە هەنگاو بنێین، ئەویش بۆ دووربوون لە چوارچێوەی تەقلیدیی بەرتەسك و پەراوێزبوون و شوێنکەوتەیی سەرشۆڕانە)[14]، هەموو گەل و نەتەوەیەك مافی ئەوەی هەیە کە خاوەنی پرۆژەیەکی شارستانیی سەربەخۆی خۆی بێت و بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە تەعبیر بکات لە شوناس و تایبەتمەندیی بیروڕاکانی، ئەوە شتێکی عەقڵانی نییە کە داوا لە گەلێك لە گەلان بکەین

[13] إدريس هاني، العرب والغرب، ص٨٦.

[14] محمد محفوظ، الاسلام والغرب وحوار المستقبل، ص٩٤.

کە دەبێت پرۆژە شارستانییەکەی کۆپی گەلێکی تر بێت[15]، ئەمڕۆ لەسەر ئاستێکی دیار دەبینین کە فیکری ناسیۆنالیستی لەسەر بنەمای شوناس تەعبیری لێدەکرێت، واتە تێپەڕاندنی ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم بەرەو شوناسێك کە ئاین و شارستانیەت تەعبیری لێدەکات، ئەمەش بە ئاشکرا لە خەباتی گەلە مسوڵمانەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات و کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت و هیندستان و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و تەنانەت گەلانی مسوڵمان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینرێت. دوو ئەزموونی ئێرانی و تورکیش نموونەی بەرچاون، کە جارێکی تر دەیانەوێت، ناسیۆنالیزم بە وێنەی شوناسێکی نوێ ڕەنگ بکەن، کە ئەویش جەختکردنەوەیە لەسەر مسوڵمانبوون و شارستانیەتی ئیسلامیی، پاشان تورکبوون و فارسبوون. لە سەردەمی بەجیهانیکردندا پاراستنی شوناس و بانگەشە بۆ فیکری نەتەوەیی و پاشکۆ نەبوون لە بواری کولتووردا، ئەو گوتارە نوێیەیە، کە لەسەر ئاستێکی فراوان گەلان و نەتەوەکان تەعبیری لێ دەکەن، تەنانەت لەناو وڵاتانی ئەوروپاشدا ئەم گوتارە هەیە، فەرەنسییەکان هەتا ئێستاش شانازی بە شوناسی فەرەنسیبوونی خۆیانەوە دەکەن، ئەمەش ڕیشەیەکی مێژووی هەیە لای ئەوان، هەروەها ئیتاڵییەکان و یۆنانییەکان و ڕەگەزە جیاوازەکانی تر کە یەکێتی ئەوروپایان پێکهێناوە، هەمان ڕۆڵ دەبینن، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین سەرکردەکانی یەکێتی ئەوروپا ئێستا هەوڵی خۆیان پڕکردووەتەوە و لەسەر دروستکردنی شوناسێکی ئەوروپی کاردەکەن، ئەویش بە مەبەستی یەکگرتنی ئاڕاستە جیاوازەکان و بە هاوشێوازە جیاوازەکانی ژیان لەلای گەلانی ئەوروپا، هەر بەم هۆیەشەوە جەنگێك دروست بووە لە نێوان ئەوانەی کە نایانەوێت واز لە شوناسی ڕەسەنی خۆیان بهێنن و ئەوانەش کە دەیانەوێت ڕوو لە ئایندە بکەن، ئەوان لە هەوڵی ئەوەدان کە شوناسێکی ئەوروپی بەکۆمەڵ دروست بکەن، کە ئەوەش چالاك و کاریگەر دەبێت بۆ کارلێك لەگەڵ شوناسە بە کۆمەڵەکانی تر، کە لە ئەنجامی یەکگرتنی یەکێتییە هەرێمییەکان، یان بۆ بەرەوڕووبوونەوەی

[15] هەمان سەرچاوەی پیشوو، ل٩٤.

مەترسییەکانی بەجیهانیبوون دروست بوون[16]. ئەزموونی یابانییەکانیش لە پاراستنی شوناس و تایبەتمەندیی کولتووری هەوڵێکی سەرکەوتوو و بەرچاوە، کە گەلێك بتوانێت لە ئاستێکی پێشکەوتنی جیهانیدا بێت و کێبڕکێ لەگەڵ گەورەترین زلهێزی جیهاندا بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا پارێزگاری لە شوناس و کولتووری خۆی بکات و لە ناو کولتووری ئەوانی تردا نەتوێتەوە.

کتێبی (ئایا یابانییەکان ڕۆژئاوایین)، کە لە ساڵی ١٩٩١ چاپ کراوە، باس لە شێوازی مامەڵەی یابانییەکان لەگەڵ ئەوی تردا دەکات، یابانییەکان سەرەتا شتەکان و فیکرە ڕۆژئاواییەکان وەردەگرن و دەیخەنە ناو کۆمەڵی خۆیان، پاشان هەرس دەکرێت و قبوڵ دەکرێت، لە دوایشدا دەیگۆڕن بۆ ماددەیەکی یابانی.[17] ئێمەش بە سەرنجدان لە ئەو ئەزموونە سەرکەوتووەی جیهان، دەتوانین کولتوورێکی نوێ بنیات بنێین کە هەنگاو هەڵبگرین لەگەڵ پێشکەوتنەکانی جیهان، ئەمەش پێویستی بە گرووپێکی پێشکەوتوو و ڕۆشنبیر و تەکنۆکرات هەیە کە رابەرایەتی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش ئەمە ببێتە هۆشیارییەك لە دامودەزگا ستراتیژی و سیاسییەکان و زانکۆکان بۆ ئەوەی ئەم هەوڵ و بۆچوونانە ڕەنگڕێژی شوناسی نەتەوەیی بکرێن. هەتا نەتەوە شانازی بە کولتوور و شارستانیەتی خۆیەوە بکات و لە ناخی هەر تاکێکدا ئیرادەیەکی بەهێز دروست ببێت کە بەرگری لە بوونی سەربەخۆیی بکات و لە کولتووری ئەوانی تردا نەتوێنەوە و بتوانن بە شێوەیەکی زانستی و عەقڵانی مامەڵە لەگەڵ پێشکەوتنەکان و بەجیهانیووندا بکەن، لەسەر ئاستێکی دیار بتوانێت کولتووری خۆی بەرەوپێش ببات و بۆ ئەم مەبەستەش نەوەی نوێی لەسەر پەروەردە بکات، بەتایبەتی لە بواری پەروەردەدا لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ، لەم ڕێگەیەشەوە بە دارشتنی پرۆژەیەکی ستراتیژی ئاراستەکانی گەشەپێدانی مرۆیی دیاری بکرێت و نیشتمانێکی سەربەخۆ و گەلێکی ئازاد و نەتەوەیەکی پێشکەوتووخواز بنیات بنرێت.

---

[16] السيد ياسين، إعادة إقتراع السياسة من الحداثة الى العولمة... سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤.

[17] محمد محفوظ، الاسلام والغرب وحوار المستقبل، سەرچاوەی پێشوو، ص٩٥.

## بەشی دووەم:
# شوناسی نەتەوەیی و سیبەری بەجیهانیبوون

شوناسی کولتووری و شارستانیی هەر نەتەوەیەك، شتێکی چەسپاو و نەگۆڕە و بەشێکە لە جەوهەری کۆمەڵێك سیمای گشتی، کە لە کولتوور و شارستانیەتێکی تر جیای دەکاتەوە، بەمەش کەسایەتی نیشتمانی نەتەوەیەك لە کەسایەتی نیشتمانی و نەتەوەیی یەکێکی تر جیا دەکاتەوە، لێرەوە پەیوەندییەکی راستەوخۆی شوناس بە کولتوورەوە هەیە.

کولتوور بەرهەمی چالاکییە عەقڵییەکانی تاکە، لەبەر ئەوە هەر نەتەوەیەك بەپێی ژینگەی تایبەتی خۆی کولتوورێکی دیاریکراوی هەیە، هەر لەبەر ئەوەیە ئاستی پێشکەوتنی کولتوورەکان جیاوازە و شارستانیەتی جیاواز بەرهەم دەهێنێت، هەر لێرەوە زانستە جۆربەجۆرەکان لە بوارەکانی مرۆیی و هونەری و تەکنەلۆژیی بەرهەم دێن، واتە عەقڵیەتی تاك بەرهەمهێنەری کولتوورە، دواجاریش ئەوە دەبێتە بەشێك لە شوناسی ئەو نەتەوەیە و هەر ئەویشە ئاستی پێشکەوتن و دواکەوتن دیاری دەکات، لەو کولتوورەشدا دەتوانین ئاستی بیرکردنەوە و ئامانجەکانی و شێوازی گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و رۆشنبیریی دیاری بکەین، ئەمەش ئەگەر توێژینەوەی زانستی ورد بکەین، لە چاخە جۆربەجۆرەکاندا دەتوانین شوناسی هەر نەتەوەیەك دیاری بکەین، کە ئەویش بەرهەمی ئاستی گەشەی فیکری و عەقڵییە لەلای هەر نەتەوەیەك، کە بۆ ئەمەش ئایین و دەسەڵاتی سیاسی و ئایدیۆلۆژیای باو لەهەر سەردەمێکدا رۆڵیان هەیە لە بنیاتنانیدا.

شوناسی هەر نەتەوەیەك بە پێی گۆڕانی زەمەن دەگۆڕێت و وێنەیەکی تر وەردەگرێت، پاراستنیشی پێویستی بە رێوشوێنی تایبەتی هەیە و پێویستی بە نوێبوونەوە هەیە، کە جیاوازە لە شێوازی سەردەمە رابردووەکان.

ئەمڕۆش کە سەردەمی بەجیهانیبوونە، شوناسی نەتەوەکان تووشی کۆمەڵێك مەترسی و بەرەوڕووبوونەوەی نوێ دەبن کە جیاوازن لە سەردەمەکانی پێشوو، لەبەر ئەوە ئەگەر هەر نەتەوەیەك دەیەوێت بە زیندوویی بمێنێتەوە و پارێزگاری لە سیما نەتەوەییەکانی بکات لەبەردەم شەپۆلەکانی بەجیهانیبووندا، پێویستی بە کۆمەڵێ گۆڕانکاری هەیە و بە ئالیەتی زەمەنە رابردووەکان بەڕێوە ناچێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دابڕاو نەبێت لەو کولتووره مێژووییەی کە تەعبیر لە شارستانیەت و ئایین و ژینگە جوگرافییەکەی دەکات، نەتەوە جیاوازەکان پێویستیان بەوە هەیە کە پارێزگاری لە سەربەخۆبوونی خۆیان بکەن و خۆیان بپارێزن لە توانەوە و لاسایی و پەراوێزبوون.

## رەهەندەکانی چەمکی شوناس:

لە سەردەمی بەجیهانیبووندا، ماناکانی ناسیۆنالیزم و پاراستنی چەمکی نەتەوایەتی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و ناتوانرێت لە رێگەی کۆمەڵێك ئەفسانەی مێژوویی و سەرکردە کاریزمەکانی درێژە بە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی نەتەوە بدرێت. بەڵکو ئەمڕۆ نەتەوە تێکەڵ بە کۆمەڵێك گۆڕانکاریی دنیای نوێ دەبێت و دەبێت نەتەوەش لە رێگەی بنیاتنانی شوناسێکی نوێوە بتوانێت خۆی وێنا بکات. پەیوەندیی نێوان شوناس و نەتەوە بە دیاریکردنی کولتوور و ئایین و شارستانیەت دیاری دەکرێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ چەمکی شوناس، دەبینین سەرەتا لە رێگەی نووسینەکانی فەیلەسوف و مێژوونووسی ئەڵمانی (فلهم دەلتای) لە ساڵانی (١٨٣٢– ١٩١١) سەری هەڵداوە، ماکس ڤیبەر لە (١٩٢٠/٤/١٨)دا دابەشی دەکات بۆ دوو ئاست کە "دەلتای" پێی دەڵێت وێنەیەکی گەردوونی، کە دەبێتە بنەمایەکی چەسپاو بۆ بیروباوەڕ و ئەو

هۆكارانەی كە رۆڵیان هەیە لە بنیاتنانی جیهانێكی واقیعی تیۆری كە لە ژێر رۆشنایی ئەمەدا دەتوانین بگەینە بۆچوونە شەفافەكان لەسەر بوونەوەر و بوون[18].

شوناس تەنها شتێكی رواڵەتی نییە، هەتا هەر هێزێكی سیاسی بتوانێت بە ئارەزووی خۆی وێنای بكات، بەڵكو وێنەیەكە بۆ پێكەوەبەستنی ئێستا و رابردووی نەتەوەیەك، كە بە شێوەیەكی گشتی سێ شتی جەوهەری لەخۆ دەگرێت:

**یەكەم:** جیهانبینیی نەتەوەیەك بۆ بوون.

**دووەم:** ئەو زمانەی كە نەتەوە تەعبیری پێدەكات.

**سێهەم:** كەلەپووری كولتووری مێژوویی[19].

ئەو وێنەیە كە نەتەوە بۆ خۆی دروستی دەكات، دەبێت لە رێگەی شوناسەوە تەعبیری لێبكات، كە رەنگدانەوەی كۆمەڵێك سیمای جیاوازە لە بواری كۆمەڵایەتی و كولتووریی، كە هەر نەتەوەیەك لە ماوەیەكی مێژوویی دیاریكراودا هەیەتی و لەو ماوەیەدا هەژموونی خۆی بەسەردا دەدات[20].

شوناس ئەو شفرەیەیە كە تاك دەتوانێت كەسایەتی خۆی پێ دابرێژێت و پەیوەندیی خۆی بە كۆمەڵگەوە دیاری بكات، لەم رێگەیەشەوە بەرامبەرەكانی دەتوانن بیناسنەوە و پێناسەی تایبەتی بۆ دابنێن، بەمەش جۆرێك لە پەیوەستبوون بە كۆمەڵگەوە روودەدات كە دەتوانرێت لە رێگەی ناسیۆنالیزمەوە تەعبیری لێبكرێت.

شوناسیش لە ڕوویەكی ترەوە دابەش دەكرێت بۆ دوو ئاستی تر.

**١. شوناسی بەكۆمەڵ:**

لەم رێگەیەوە تاكەكان خۆیان پەیوەست دەكەن بە كۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە، بەمەش ئاستی جۆربەجۆر لە شوناس لە ناو كۆمەڵگەكەدا دەردەكەوێت، كە دەبێت

---

١٨ هاني نسيرة، مفهوم الهوية بين الثبات والتحول، ٢٠٠٧/١/١: http:www.islamonline.net.

١٩ محمود سمير المنير، العولمة و عالم بلا هوية، مصر، دار الكلمة للنشر، المصورة، ط ٢٠٠٠م، ص١٤٦.

٢٠ جمال طاهر، الهوية الثقافية والعالم الاسلامي، قضايا دولية، العدد: ٢٢٧، ٨/مايو/١٩٩٩، ص٣.

پارتێکی سیاسی، یان گرووپێکی مەزهەبی، یان ڕێکخراوێکی مەدەنی تەعبیری لێبکات.

**٢. شوناسی خۆیی تاك:**

كه ئەویش دەكەوێتە ژێر كاریگەری شوناسی كۆمەڵگەوە و ئیلهام و ئینتیمای لێ وەردەگرێت و پابەند دەبێت بە ڕەهەندی ئایینی و جیهانبینی و كولتوورییەوە.

لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانین بڵێین كە بوونی كەناڵی ئازاد و دیموكراسی زۆر گرنگە بۆ گەشەی شوناسی تاك و كۆمەڵ، چونكە هەتا گفتوگۆ و پەیڤینی زیاتر لەگەڵ نەتەوە و گەلانی شارستانیەتەكانی تر زیاتر بكرێت، هەڵە و ناتەواوی و كەموكوڕییەكان زیاتر هەست پێدەكرێن، لەلایەكی تریشەوە لایەنە گەشەكردوو و ڕۆشنەكانی نەتەوە زیاتر بەدەر دەكەون، لێرەشەوە بزاڤێكی چاكسازیی شوناس و بەرەوپێشبردن و گەشەپێدانی سەرهەڵدەدات.

چونكە شوناس لە هەر قۆناغێكی مێژوویدا دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئەو زەمەنەی كە تێیدا دەژی و هیچ شوناسێك نییە كە دابڕاو بێت لە ژینگە و دەوروبەر و بە تەنها بتوانێت درێژە بە مانەوەی خۆی بدات. (زۆر لە پسپۆڕان لەو باوەڕەدان كە شوناسی تاكەكەس پەیوەستە بە تاك لە ڕووی هەست و سۆز و بۆچوونە تایبەتییەكانی خۆیەوە، زۆر لە تیۆریسان ئەوەیان ڕەت نەكردووەتەوە كە دانبنێن بە شوناسی بە كۆمەڵ، بەڵام لەهەمان كاتدا، هەریەكەیان بە جیای دەبینن لەوی تر، هەر لەم ڕوانگەیەوە شوناس بەوە پێناسە دەكەن كە بریتییە لە جیاكەرەوەكانی هەست و سۆزی تاك كە شێوازی كەسایەتی دیاری دەكات، بەمەش تاك دەبێتە كائینێكی سەربەخۆ)[٢١].

ئەگەر سەیری شوناسی كوردی بكەین، دەبینین كە بە پلەی یەكەم پەیوەستە بە تایبەتمەندییەكانی گەلی كورد، كە جیای دەكاتەوە لە نەتەوەكانی تر، واتە كۆمەڵێك بنەمای چەسپاو هەن كە سیمای تایبەتی نەتەوەیی بۆ كورد دادەڕێژن، هەر ئەوەش

---

[٢١] أحمد طول محمدي، جهاني شدن فرهنگ، هويت، تهران انتشارات نشوني، ١٣٨٢، ل٢٢٢.

ئەو کۆمەڵگەیە دروست دەکات کە پێی دەڵێن نەتەوەی کورد، هەر تاکێکی کۆمەڵگەی کوردیش، کە هەست دەکات خاوەن شوناسێکە، زۆرتر هەوڵ دەدات رۆڵی هەبێت لە کۆمەڵگەدا و زۆرتر شانازی دەکات بە نەتەوەکەی خۆیەوە، لەهەمان کاتدا لە هەوڵی ئەوەدایە، کە وێنەیەکی جوانتری بۆ دروست بکات لەبەردەم نەتەوەکانی تردا، شوناسی تاك رەنگدانەوەی ئەو ژینگەیەیە کە تێیدا دەژی، لەبەر ئەوە ئەگەر نەتەوەیەك بیەوێت شوناسێکی پێشکەوتوو بنیات بنێت، دەبێت لە هەوڵی چاکسازیی ژینگەکەی خۆیدا بێت لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە.

ئەگەر سەیری کۆمەڵگەی کوردیی بکەین، سەرەتا لە تاکەوە پاشان بۆ سنووری کۆمەڵگە، دەبینین کە سیما و وێنەیەکی تایبەتمان نییە بۆ شوناس، بەتایبەتیش لەلای تاك جۆرە ئاڵۆزییەك هەیە کە ناتوانێت تەعبیر لە جیهانبینیی خۆی بکات بە باشی لە رووی ئایینی و شارستانییەوە، بەمەش ئینتیما لای تاکی کورد ناتوانرێت لە وێنەیەکدا ببینرێت، بەڵکو دابەش بووە بۆ سەر کۆمەڵێك ئاستی جیاواز، بەمەش تاکی کورد لەیەك جۆر ئینتیماوە چووەتە بازنەی کۆمەڵە ئینتیمایەکەوە، گرووپەکانیشی نەیانتوانیوە تەعبیر لە شوناسێکی دەستەجەمعیی بەکۆمەڵ بکەن، بەڵکو هەریەکەیان هەڵگری شوناسێکە کە تەعبیر لە ئایدیۆلۆژیا و پەیوەندییە سیاسییەکانی دەکات، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بڵێت لە دەرەوە باس لە شوناسی نەتەوەیی دەکرێت، بەڵام لە واقیعدا چەند جۆرێك لە شوناس هەیە کە زۆربەیان دژی ئەوی ترن و کار لەسەر لاوازکردنی یەکتر دەکەن، بەمەش شوناسە نەتەوەییەکە لەبەردەم لاوازبوون و پارچەبووندایە، پرۆژەیەکی گشتی نییە بۆ سەرخستنی و ستراتیژیەتێکی نەتەوەیی نییە لە کۆکردنەوەیان، ئەمەش مەترسییەکە بۆ ئایندە کە کورد وەك نەتەوە نەتوانێت تەعبیر لە شوناسێکی یەکگرتوو بکات، واتە کورد لە ناوخۆدا پرۆژەیەکی نییە بۆ یەکگرتنەوە لەسەر بنەمای خاڵە نەتەوەییەکان و دەبێتە هۆی لاوازکردنی ئینتیما و شوناسی نیشتمانی و نەتەوەیی، چونکە کاتێك کە تۆ شوناسێکی دیاریکراوت نییە، ناتوانی لە بەرامبەر ئەوانی تردا پێناسی خۆت بکەیت، یان لە بەردەم شەپۆلەکانی

بەجیهانیبووندا خۆت بگریت، بەمەش بەدەم هەر رەشەبایەکی دەرەوەی خۆت دەبیتە ئەو دەنکە لمەی کە گڤەی باکان بەرەو هەر شوێنێك بیانەوێت، دەتبەن.

ئەگەر سەیری هەر بوونەوەرێکی زیندوو بکەین، دەبینین سەر بە جۆرێکە، بە درێژایی مێژوو پارێزگاری لە مانەوەی جۆرەکەی خۆی دەکات و ناگۆڕێت، ئەمەش بەرپەرچی گۆڕانەکانی تیۆری پەرەسەندن دەداتەوە، چونکە لە شفرەی بۆماوەیی هەر تاکێکدا، جۆرێکی سەربەخۆ هەیە کە پارێزگاری لە مانەوەی جۆرەکەی دەکات.

زیندەوەران بە شێوەیەکی گشتی دەکەونە ژێر کاریگەریی ژینگە و دەوروبەر، بەڵام جیناتی سەر کرۆمۆسۆمەکان پارێزگاری لە مانەوەی جۆرەکان دەکات، بەڵام لە کۆمەڵگەی مرۆییدا جۆرێکی تر لە پەیوەندی هەیە کە پەیوەستە بە فیکر و گۆڕانی ئیرادە و کولتوور و بنیاتنانی شارستانیەت. پێشکەوتنەکانی ئێستای جیهان، کاریگەریی راستەوخۆیان هەیە لەسەر جارێکی تر دیاریکردنی پێگەی نەتەوە لەسەر ئاستێکی جیهانی، چونکە ئێستا جیهان وەك گوندێکی لێهاتووە و لەم گوندەشدا هەموو نەتەوەکان ناتوانن بمێننەوە.

بە درێژایی مێژوو دەیان نەتەوەی جیاواز هەبوون کە تواونەوە و نەماون، لەم سەدە نوێیەشدا پرۆسەی توانەوەی نەتەوەکان بە خێراییەکی زۆرتر روودەدات، چونکە کەم نەتەوە هەن بتوانن لەبەردەم ئالیەت و سیستم و کولتووری نوێی جیهاندا خۆیان بگرن، کە لە راستیدا ئەویش لە جەوهەردا هەڵگری کولتووری نەتەوەیەکی ترە کە خۆی لە شوناسی رۆژئاواییبوون و ئەمریکاییبووندا دەبینێتەوە.

بەجیهانیبوون لە کۆمەڵێك رەهەندی جۆربەجۆرەوە کاریگەریی لەسەر شوناسی تاکی کورد هەیە، کە ئەویش سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییە، لەبەر ئەوەی کە کورد هەتا ئێستاش کۆمەڵێك دامودەزگای چەسپاوی نییە لەم بوارانەدا، ئەوا زۆرتر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی رەهەندە نوێیەکانی بەجیهانیبوون و کەمتر دەتوانێت بەرگری بکات و هێڵەکانی بەرگری بەهێز بکات.

ئاڵۆزی و شپرزیی شوناسی کۆمەڵگەی کوردی وایلێکردووە کە تەنانەت بەرامبەرەکانیش دان نەنێن بە بوونێکی سەربەخۆیدا، هەر ئەوەشە کە تەنانەت لە ئەمڕۆی عێراقی نوێشدا، بەرامبەرەکان زۆر بە ناڕەحەت دەتوانن تەنانەت فیدراڵیەتیشی پێ ڕەوا ببینن، چونکە هەڵوێستی ئەوان لەسەر وێنای ئێمە دروست بووە، ئایا ئێمە تا چەند یەکگرتووین، خاوەنی چ بڕیارێکین؟ تا چەند بڕیاری سیاسی هەڵقوڵاوی ویست و ئیرادەکانی کۆمەڵگەیە؟ شپرزیی شوناسی سیاسیی کورد وایکردووە، کە تاکی کوردیش هەست بە لاوازیی ئینتیما بکات و لە ناو گەنجی کۆمەڵگەکەدا توێژێکی بێباك و بێ ئینتیما دروست بکات، لێرەشەوە دەبینین کە هێڵەکانی بەرگری لە کورد ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز دەبێت، چونکە شوناسی تاك وێنایەکی نییە و شوناسی کۆمەڵیش بێ ناوەڕۆك و بێ ستراتیژیەتە.

(لەلایەکی ترەوە شوناسی نەتەوەیەك کاتێك لای تاکەکانی مانا پەیدا دەکات و دەبێتە بەشێك لە سایکۆلۆژیای تاك کە ئامادەی قوربانیدان بێت، ئەو کاتەیە کە ئەو شوناسە ڕەنگدانەوەی هەبێت لەسەر باری گوزەران و ژیان و باشترکردن و ڕەهەندەکانی ژیانی لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە و لەم ڕێگەیەوە تاك بتوانێت پەیوەست بێت بەم شوناسەی کە هەیەتی)[٢٢].

لەبەرئەوە هەر بەکارهێنانێکی خراپی دەسەڵات و ئەنجامدانی گەندەڵی کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ئینتیمای تاك، چونکە تاك کاتێك نیشتیمانی خۆی خۆش دەوێت کە ئەو نیشتیمانە ببێتە لانکەیەکی ئارام و خۆشگوزەرانی و بە ئازادیی خۆی بتوانێت تەعبیر لە بیروڕاکانی بکات، لێرەوە دەبینین کە شوناس لە ڕژێمە تاکڕەوەکاندا شتێکی سەپێنراوە و تەنها ڕووکەش و ڕۆتینێکی دەرەوەی دەسەڵاتی سیاسییە، کە بەردەوام بە ناوی گەلەوە قسە دەکات بۆ ئەوەی هێز بۆ خۆی پەیدا بکات و بە دەسەڵاتێکی بەهێز دەربکەوێت، بۆ ئەم مەبەستەش پەنا دەباتە بەر دروستکردنی سوپای بەهێز و دامودەزگای ئەمنی جۆربەجۆر و پشتبەستن بە

---

[٢٢] محمد محفوظ، الاسلام والغرب وحوار المستقبل، المركز الثقافي العربي، بيروت ١٩٨٨، ص١٥٠.

سیخوڕیی، بەڵام لە کاتی تەنگانە و بەرەوڕووبوونەوەی جەنگ و پشێوییدا هەست دەکات ئەو ئینتیمایە چەند دوور بووە لە راستی و ئەوانەش کە لەگەڵی بوون تەنها یان لەبەر بەرژەوەندیی بووە، یان لە ترسدا بووە، هەرەسی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات لە کۆتاییەکانی سەدەی رابردوو، رژێمی بەعسیش لە عێراق لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا و هەرەسی رژێمەکانی لیبیا و میسر و تونس شایەتی ئەو راستییەن، بەڵام بە پێچەوانەوە لە وڵاتە دیموکراسییەکاندا لەجیاتی پەنابردن بۆ ترس و هێز، هاووڵاتی بەشداریی پێدەکرێت لە دەسەڵاتی سیاسی و راستگۆییانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و لە هەمان کاتدا گوزەرانێکی باشی بۆ دابین دەکرێت، بەمەش وا لە هاووڵاتی دەکرێت کە نیشتیمانی خۆی خۆشبوێت و رێز لە یاسا بگرێت و بە راستگۆیانە خزمەتی دامودەزگاکانی حکومەت بکات، لێرەشەوە دەبینین تاك پیرۆزییەك دەدا بە کۆمەڵێك مانا و رەمزی نەتەوەیی و نیشتیمانی، بەڵام نەك بە شێوەیەکی ئەفسانەیی وەك لە پێناسە تەقلیدییەکەی ناسیۆنالیزمدا باس دەکرێت، بەڵکو ئەمڕۆ ئەو رەمزانە کاتێك رێزیان دەبێت کە شەفاف و راستگۆ و خزمەتگوزار بن.

بەپێچەوانەوە سەرکردە گەندەڵ و خیانەتکار و دووڕووەکان دەکەونە بەر نەشتەری رەخنەی راگەیاندن و کۆمەڵگەی مەدەنی و هاووڵاتیان بەگشتی، بەمەش رێگەیەك بۆ بەپیرۆزگرتنی سەرکردەی کاریزمی تەقلیدیی نامێنێتەوە. ئەگەر سەرنجیش بدەین ئەمڕۆ نووسینەوەی مێژوو بە جۆرێکی ترە کە ناچێت تەنها باسی لایەنە ئیجابییەکان و سەرکەوتنەکان بکات، بەڵکو زۆرتر دەگەڕێن بە شوێن سلبیات و لایەنە ناتەواوەکانی، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ کەڵك لە هەڵەکانی وەربگرێت و جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە، لێرەشەوە شارستانیەت و ئایین و بەها باڵاکان وێنەیەکی تر دروست دەکەن، ئەمەش جیاوازییەکی گەورەیە لە نێوان دەسەڵات لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، چونکە لەلای ئێمە دەسەڵات دەیەوێت، شوناسێکی دەستکردی رووکەش دروست بکات، کە پەیوەستی دەکاتەوە بە سیاسەتی رۆژانەی حیزبی دەسەڵاتدار و رۆڵێك بۆ بنەما جەوهەرییەکان ناهێڵێتەوە، لە ئایین و شارستانیەت و کولتوور کە

بەشداریی دروستکردنی ئەو شوناسە بکەن، لەبەر ئەوە تاك لە کۆمەڵگە باشوورییەکاندا، بەردەوام جۆرێك لە بێزاری و رقلێبوونەوەی پێوە دیارە بە تایبەتی لەلای گەنجان و دەیانەوێت لەم شوناسە رزگاریان بێت و بەردەوام وای لە قەڵەم دەدەن کە ئەوان لە زیندانێکی گەورەدا دەژین، هەر ئەمەشە هۆکاری ئەوەی گەنجان بەپۆل روو لە رۆژئاوا دەکەن و ئەویّ بە شوێنی بەدیهاتنی خەونەکانیان دەزانن، لێرەوە تاك ناتوانێت پێناسەی خۆی بکات و بەرامبەرەکانی بناسێت، بەڵکو تاکێکی شکستخواردووە و بەردەوام دەیەوێت ئەم بەرگی لاوازییە فڕێ بدات و خۆی بداتە پاڵ بەهێزەکان.

گەنج لەمجۆرە کۆمەڵگەیانەدا خاوەنی سایکۆلۆژیایەکی تێکشکاوە لەبەرامبەر ئەوانی تردا و خۆی بەکەم دەزانێت، ئەمەش دەچێتە هەموو بوارەکانەوە لە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری وەك "فرانس فانون" دەڵێت هەموو رەشپێستێك خەو بەوەوە دەبینێت کە رۆژێك لە رۆژان پێستی سپی بووایە، هەر لەبەر ئەم هەستی خۆبەکەمزانینەیە کە تاك هەست دەکات ئەوان هەموو شتێکن و ئەمان هیچ، ئەوان پێشکەوتووخواز و ئەمان دواکەوتوون.

کاتێك تاك هەست ناکات خاوەنی شوناسێکە، ناتوانێت بە رۆشنی سەیری ئایندە بکات و ئێستاشی بە جوانی تێبگات، لەبەرئەوە لەم کۆمەڵگەیانەدا دەبینین بەردەوام ئاڵۆزی هەیە، ناڕەزایی هەیە، داوای فراوانکردنی سنوورەکانی ئازادی و دیموکراسی هەیە، داوای باشکردنی گوزەران و شەفافیەت لە خەرجیی داراییدا هەیە.

## بنەماکانی شوناس:

لە ڕاستیدا شوناس لەسەر کۆمەڵێك بنەمای گرنگ دادەمەزرێت، کە هەموویان بە یەکەوە دەتوانن پێناسێك بۆ تاك دروست بکەن، لەوانەش:

١ـ زمانی نیشتیمانی و شێوەزارە لۆکاڵییەکان کە پەیوەستن بە زیندووڕاگرتنی نەتەوە و گەشەپێدانی لە ئایندەدا، ئەویش لە رێگەی بەکارهێنانی بە شێوەیەکی

زانستی له پرۆگرامەکانی خوێندن له قۆناغه جۆربەجۆرەکاندا، هەروەها له حکومەتدا له بواری کارگێڕی و دادوەری و لەهەمان کاتدا پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، دەبێت له ڕێگەی شێوەزارێکی سەرەکییەوە نەتەوە بە یەکەوە گرێ بدرێت.

٢ـ بەها ئایینی و نیشتیمانییەکان به درێژایی مێژوو: که ئەمەش شوناسێك بۆ نەتەوە دروست دەکات و دەیپارێزێت له توانەوە له ناو گەلانی تردا، هەروەها لەم ڕێگەیەشەوە بەرگرییەکی باش دەدات بە گەل له بەرامبەر هەر هەوڵێکی توانەوەدا و پارێزگاری له تایبەتمەندییە نەتەوەییەکان دەکات.

٣ـ ترادسیۆن و کەلەپووری نەتەوە پارێزگاری له بەها باڵاکانی نەتەوە دەکات، که ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئاستی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی نەتەوەیەکە له ڕابردوودا.

٤ـ مێژووی خەباتی نەتەوەیی که لەپێناو پاراستنی نیشتیمان و کەرامەتی نەتەوە و بەها باڵاکانیدا ئەنجامی داوە، بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و ئازادیی و تایبەتمەندییەکانی[٢٣].

شوناسی کولتووری بریتییە له تۆڕێکی چنراو و پێکەوەگرێدانی جیهانی ئایین و زمان و مەعریفە و بەرهەمەکانی نەتەوە، له ڕووی هونەر و ئەدەب و کەلەپوور و بەهاکان و ترادسیۆن و ئەخلاق و مێژوو و ویژدانی نەتەوە، هەروەها پێوەرەکانی عەقڵ و سلوك، هەر نەتەوەیەك خاوەنی جۆرێکی تایبەتە لەو بەهایانە و بەمەش له نەتەوەیەکی تر جیادەکرێتەوە.

ئەم ڕەگەزانەش بە چەسپاوی نامێننەوە، بەڵکو بەردەوام له جوڵە و گۆڕاندان و وەك پرۆژەیەك بۆ ئێستا و ئاینده دەردەکەون، ئەم چەمکانه کاریان تێدەکرێت و پێی کاریگەر دەبن، هەروەك ڕێژەیەکی باش له کولتووری مرۆیی هاوبەش دروست دەبێت

---

٢٣ محمدالحنفي، الهوية والعولمة: www.makarabat com.

له ئەنجامی پەیڤین و تێکەڵبوونی کولتوور و نەتەوە جیاوازەکان، بەمەش هەر کولتوورە ڕێزێکی تایبەت لای تاك دروست دەکات و هەوڵی پاراستنی دەدات[٢٤].

هەندێك لە بیرمەندان وای دەبینن کە تایبەتمەندی و شوناس بە شێوەیەکی گشتی لە شتە گۆڕاوەکانە، زۆرجاریش بە چەمکێکی ئایدۆلۆژیی لە قەڵەم دەدەن، لەبەرئەوە دەشێت شوناس بخرێتە قاڵبی جۆربەجۆرەوە، ئەم چەمکەش گۆڕانی بەسەردا دێت بەپێی شێوازی بەکارهێنان و گرنگیپێدان، شوناس لەلایەنی ئایینی و نیشتیمانی و نەتەوەییەوە زۆر بەکاردێت، ئەمەش دەگۆڕێت بەپێی ئەو باکگراوەندە ئایدولۆژییەی کە پێی دەدرێت، لەبەر ئەوە ئێمە گۆڕان زۆر دەبینین لە شوناسی کۆمەڵگەکان، لەهەمان کاتدا سیاسەت زۆرترین کاریگەری لە سەر ئەم چەمکە هەیە، لەبەر ئەم هۆکارەشە زۆر کەس پێی وایە شوناس چەمکێکی سیاسییە و لە ململانێ سیاسییەکاندا دەردەکەوێت.

"بایار" لەو بڕوایەدایە کە شوناس لە ئەوپەڕیدا کە پێی دەوترێت (شوناسی ڕەسەن) ناتوانێت لە چوارچێوەی سیاسەت دەربچێت، چونکە (پەیوەندییەکی ئاڵۆز هەیە لە نێوان دیدە کولتوورییەکان و پراکتیککردنی سیاسەت و شێوازی بزواندنی خەیاڵدانی خەڵك لە بزاڤی سیاسی و خەیاڵی سیاسی)دا.

بایار دەربارەی جەنگەکانی ئەم دواییەی یوگۆسلاڤیا و قەفقاز و جەزائیر و ناوچەی دەریاچە گەورەکان لە ئەفریقیا، دەڵێت: (ئەم ناکۆکییانە لەسەر شوناس ڕوویانداوە، ئەم لایەنانە هێزی لەناوبەری خۆی لەوەوە وەردەگرێت کە شوناس و کولتووری ئەم لەبەرامبەریدا شوناسێکی سیاسی هەیە کە فۆرمێکی وەهمی وەرگرتووە بۆ لەناوبردن، لە ڕاستیدا هەر دوو شوناسە ناکۆکەکە شێوازێکە کولتووری سیاسی ئایدولۆژیای بەخۆوە گرتووە کە ڕیشەیەکی مێژوویی هەیە، لەبەر ئەوە شوناسێکی ئاسایی نییە کە بارودۆخ فەرزی بکات)[٢٥].

---

[٢٤] خلف بشير، سؤال الهوية وصدمة العولمة: www.wanarab.com.

[٢٥] جان فرانسوا بايار، أوهام الهوية، ترجمة: حليم طوسون، دار العالم الثالث، القاهرة، ١٩٩٨، ص٧.

لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین وێنەیەکی دیاریکراو نییە بۆ شوناس، بەڵکو شوناس بنیاد دەنرێت، ئەویش وێناکەی دەگۆڕێت، بەپێی گۆڕانی ناکۆکییەکان و دەوڵەتەکان و ئایدۆلۆژیای باڵادەست بەسەر دەوڵەتدا، ئەگەر ناکۆکی و ململانێکان لە فۆرمێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی بوون ئەوا شوناسی نیشتیمانی و نەتەوەیی دەردەکەوێت و گەشە دەکات، ئەگەر ناکۆکییەکان ئایینی بوون ئەوا شوناسی ئایینی خۆی نمایش دەکات، ئەمەش بە ئاشکرا دەبینرێت لەو ناکۆکیيانەی کە لەم ناوچەیەدا روویانداوە بەتایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست و سەرەتای ئەم سەدەیەدا و لە ناکۆکی نێوان عەرەب و ئیسرائیلدا بە روونی بەرجەستە بووە.

بەڵام لەلایەکی تریشەوە نابێت شوناس دابڕاو بێت بۆ فۆرمێکی تایبەتی، بەڵکو دەبێت تیایدا رێز لە ئیرادە و ویست و ئایینی لایەنە جیاوازەکان بگیرێت، بەتایبەتی لە زەمەنی بەجیهانیبووندا. واتە نابێت شوناس جێگەی ئایدیۆلۆژیا هەرەسکردووەکان بگرێتەوە کە تەعبیر لە بۆچوونێکی سیاسیی بەرتەسك بکات، بەڵکو دەبێت لە ئاستێکدا بێت کە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە و هەر لایەك بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆی بە خاوەنی بزانێت، چونکە دواجار دەسەڵات پێویستی بەوە دەبێت کە هەموولا رێزی لێبگرن و بەرگری لێبکەن و ئامادە بن خزمەتی بکەن لە هەردوو لایەنی مەدەنی و شۆڕشگێڕییەوە، بۆ ئەوەی ئەو شوناسە نیشتیمانێکی هەبێت و هەڵگری سیماکانی نەتەوەیەك بێت کە زمانێك تەعبیری لێبکات.

(ئەریك دوبان) نووسەر و رۆژنامەنووسی فەرەنسی لە کتێبەکەیدا (هیستریا یان شوناس) جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە هەزارەی سێهەم سەرەتاکەی بە جۆرێك لە نایەکسانی دەستی پێکرد لە نێوان هەژاران و دەوڵەمەنداندا، بەڵکو لە نێوان تاکەکانی هەر گەل و کۆمەڵگەیەکدا، ئەمەش لە دوای سەدەیەك بانگەشەکردن هات بۆ یەکسانی و رەخساندنی هەلی گونجاو بۆ هەموو لایەك لە ژێر سایەی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم و رژێمی سۆسیالیستیدا، بەڵام کاتێك کە ئەو بۆچوونانە راستگۆیی خۆیان لە زەمینەی واقعیدا لە دەست دا، لەهەمان کاتدا فیکرەی یەکسانی رەها بە زۆری لە

واقعیدا پاشاکشەی کرد، لە بەرامبەر ئەمەدا نەزعەیەکی تر سەریهەڵدا کە ئەویش (جیاوازییە لە ئەوانی تر) لەم روانگەیەشەوە ئێمە دەتوانین ئەم پرسیارە بکەین:

ئایا بەجیهانیبوون دەتوانێت لە ماوەیەکی مامناوەند و دووردا شوناسەکانی تر بخاتە ناوخۆی و هەرەسیان پێ بهێنێت؟ ئەگەر ئەمە روو بدات بە چ شێوازێك دەبێت؟ بە چ هۆکارێك دەبێت؟ ئەگەر سەیر بکەین لە رووی ئابوورییەوە توانیویەتی ئابوورییەکەیان هەڵبووەشێنێت و بەتاڵی بکاتەوە لە هەموو ئەو بنەما بەهێزانەی کە کار لەسەر مانەوەیان دەکات، لەهەمان کاتدا توانیویەتی مەرج و شێوازی بازاڕی خۆیان بەسەردا بسەپێنێت و رازییان بکات.

لە لایەکی تریشەوە (ئەریك) جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە کێشەکانی ئینتیما و شوناس لە هەندێك وڵاتدا بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی و جەنگی گەورە و هەزاران کەس بەهۆیەوە گیانیان لە دەستداوە.

شوناس، لە رووبەکەوە ئەگەر لەسەر بنەمایەکی مرۆڤدۆستی و فراوان و لێبوردە دانەمەزرێت، ئەوا وێنەیەکی ئایدیۆلۆژی لەخۆ دەگرێت و دەبێتە سەرچاوەی کوشتار و توندوتیژی، وەك ئەوەی لە ئەوروپای رۆژهەڵات و بۆسنە و هەرسك و ناکۆکییەکانی بەلقاندا بینرا و ئێستاش لە فەلەستیندا دەبینرێت.

هەروەها لە دوای رژێمی بەعس لە عێراقدا، توندوتیژییە تائیفی و مەزهەبییەکان بوونە هۆی گیانلەدەستدانی سەدان هەزار کەس، بەمەش بانگەشە بۆ پاراستنی شوناسی مەزهەبی زیاتر ناکۆکییەکانی خوێناوی کرد، لێرەوە ئەو شوناسە بەرتەسکە سیاسی و حیزبییانە، نەك چارەی ئەو جۆرە کێشانە ناکەن، بەڵکو زیاتر کێشەکان ئاڵۆزتر دەکەن و رێگەیەك بۆ پێکەوەژیان ناهێڵنەوە، ئەمەش گرفتێکی گەورەی شوناس و پاراستنیەتی، ئەگەر لەسەر بنەمایەکی لێبوردە و ئازادی و دانانان نەبێت بە بوونی مافەکانی بەرامبەر لە هەموو رووەکانی سیاسی و ئابووری و کولتوورییەوە، ئەمەش جێگرەوەی هەمان ئایدیۆلۆژیای ناکۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیستییە، بەڵام لە قاڵبێکی تردا، جێگرتنەوەی شوناس بە ئایدیۆلۆژیا مەترسییە لەسەر گەلانی

ئەم ناوچەیە، چونکە زیاتر گرژی و ئاڵۆزییە نەتەوەییەکان زیاد دەکات، هەریەکەیان پەنا دەباتە بەر ئایدیۆلۆژیا مەزهەبی و نەتەوەییەکان و دەیکاتە بەشێك لە شوناسی خۆی، لەبەر ئەوە گۆڕان بەرەو چاکسازی و پێکەوەژیان و چەسپاندنی دیموکراسی روونادات، ئەگەر مەزهەب و نەتەوەیەك بکەونە شوێن شوناسی ئینتما بچووکەکان، تەنانەت ناتوانن هێزەکانی هەرێمێکی بچووکیش تیایدا بەیەکەوە بژین و سەرئەنجام شەڕ و کوشتار و شەڕی ناوخۆی کاولکاری لێدەکەوێتەوە، هەر هێزێکی سیاسی لەم ناکۆکییانەدا شەرعیەت دەدا بە خۆی و خۆی دەکات بە پارێزەری شوناسی نەتەوە، کەواتە بە جۆرێك لە جۆرەکان تاکڕەوی و سڕینەوەی جیاوازی و لەناوبردنی بەرامبەرەکان بەردەوام دەبێت و قوربانییەکانیشی زۆر زیاد دەکات.

لە سەردەمی بەجیهانیبووندا، جۆرێکی تر لە بەرەوڕووبوونەوە روودەدات بەتایبەتی لە بەرامبەر شوناسدا، ئەمەش گرفتێکە لە جیهانی ئیسلامییدا، کە ئەویش شێوازی مامەڵەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی زانیارییدا، ئایا کێ دەیەوێت، هۆکارەکانی چین؟ کاریگەری لەسەر لایەنە جیاوازەکانی شوناس چییە؟ لێرەوە شوناسی نەتەوەیی بە چەمکە تەقلیدییەکەی دەکەوێتە ژێر پرسیار و ناتوانێت وەڵامدەرەوەی هۆکار و پێکهێنەرەکانی شوناسی نوێ بێت، کە دەبێت لە چوارچێوەی زانست و پێداویستییەکانی شۆڕشی زانیارییدا خۆی دابڕێژێتەوە، هەتا ئێستاش لە جیهانی ئیسلامییدا زۆربەی عەقڵی رۆشنبیران و نووسەران و رۆژنامەنووسان، تەنانەت سیاسییەکانیشی سەرقاڵی کێشەی رەسەنایەتی و مۆدێرنیزمن، دەیان ساڵە هێرش و ململانێیەکی توند لە نێوان ئەم دوو بەرەیە هەیە، تەیاری رەسەن بەرامبەرەکان بە عەلمانی و غەربزەدەیی ناواقیعی لەقەڵەم دەدەن، مۆدێرنیزمەکانیش بەرەکەی تر بە کۆنەخواز و توندڕەو و مێشك بەستوو ناوزەد دەکەن، ئەم جەنگە بێمانایە کۆمەڵگەی دابەش کردووە بە دوو بەرەوە کە هەر یەکەیان خەڵکی رەشۆکی و سادە تەیار دەکات بە بوغز و رق و زۆرجاریش کە بوار دەڕەخسێت، دەبێتە جەنگێکی خوێناویی، بەتایبەتیش ئەگەر یەکێك لەم دوو لایەنە لە دەسەڵاتدا بن، ئەوا بەرەی دەرەوەی

دەسەڵات دەکاتە قوربانی و دەرگای زیندانەکانی بۆ دەکاتەوە و بە جۆرەها شێواز دەیەوێت بنەبڕی بکات، بەمەش دیموکراسیەت مانایەکی نامێنێت و پەراوێزێك نامێنێتەوە بۆ ئازادی و لەم فەزا سیاسییە ئاڵۆزەدا جیاوازییەکان دەکوژرێن، هەر لە رۆژهەڵاتدا ئەزموونێکی تر هەیە، بۆ بنیاتنانی شوناسێك کە تێکەڵە لەگەڵ شۆڕشی زانیاری و لە هەمان کاتدا رەمزێکە بۆ پاراستنی ئینتیمای نەتەوە و ئایین و نیشتمان، ئەویش ئەزموونی ژاپۆنە، کە ئەزموونێکی رۆژهەڵاتییە، هەروەها ئەزموونی چینییەکانیش لەم رووەوە ئەزموونێکی سەرکەوتووە، جیهانی ئیسلامیش بە هەموو نەتەوە مسوڵمانەکانەوە دەتوانێت لە چوارچێوەی شوناسە ئایینی و نەتەوەییەکەیدا بچێتەوە و لەسەر بنەمایەکی فراوانتر سەر لەنوێ بە لەبەرچاوگرتنی پێشکەوتنە زانستییەکان و بەتایبەتش لەسەر بنەمایەکی مرۆیی و شارستانی بنیات بنێتەوە کە مانایەك ببەخشێت بە ئازادی و قبوڵکردنی بەرامبەر و جیاوازیی، هەتا کۆمەڵگە لەسەر ئەو دوو رەوتە دابەش بکرێت نە دیموکراسی مانایەکی دەبێت و نە دەتوانرێت ئەزموونێکی جوان لە بەرامبەر ئەزموونە دیموکراسییە رۆژئاواییەکەدا بنیات بنرێت، چونکە ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامییدا پێی دەڵێن شوناس، تەنها بەشێکە لە عورف و کولتوورێکی تەقلیدی کە باکگراوەندە بە بوغز و کورتبینی و قەبووڵنەکردنی بەرامبەر لەلایەك و لەلایەکی تریش نوخبەیەکی تر بە عەقڵێکی پەراوێز و شوێنکەوتە و تەقلیدگەریی رۆژئاوا کار دەکەن، کە خۆیان دارنیوە لە هەموو عەقڵ و ئیرادە و پێشکەوتن و شارستانیەت و بەهایەکی مرۆیی، وا دەزانن کە تەنها هۆکاری پێشکەوتنی ئێمە ئەوەیە، بچینە سەر شوناسی ئەوان و واز لە ئینتیمای خۆمان بهێنین و بچینە ناو شارستانیەتی ئەوان و ببینە قەرەجێك لەبەردەم دەرگاکانی ئەواندا، کۆمەڵگەکانی ژاپۆن و چین، نموونەی کۆمەڵگەی ژمارەیی و زانیارییین، رۆڵێکی گەورەیان هەیە لە بواری پەیوەندییەکان و تەکنۆلۆژیادا، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم پێشکەوتنە کاریگەری نەبووە بۆ سەر شوناسی ژاپۆنیبوون یان چینیبوون، بەڵکو زیاتر ئەو پێگەیەی بەهێز کردووە، تاك هەست بە بوونێکی زیاتری نوێ دەکات و

ئێستا دەتوانێت پێناسەی خۆی بکات لە بەرامبەر ئەوی تردا بەتایبەتی رۆژئاوادا، لێرەوە هیچ جیاوازییەك دروست نەبووە لە نێوان ترادسیۆن و مۆدێرنیزمدا، بەڵکو پرۆژەیەکی نیشتمانی گەورە هەیە کە هەموو جیاوازییەکان لەخۆ دەگرێت و لەو ئاستە فراوانەدا هەر تاکێك تەعبیر لە شوناسە نیشتمانی و ئایینی و نەتەوەییەکەی دەکات، واتە کۆمەڵگەی دابەش نەکردووە بۆ کۆنەخواز و نوێخواز، یان عەلمانی و ئیسلامیی کە بەشێکی زۆر لە تواناکانی کۆمەڵگەی کوشتووە و بەردەوام لە بازنەی ململانێیەکی بێمانادا دەخولێتەوە، کە مانایەك بۆ ئازادی تاك و تایبەتمەندییەکانی ناهێڵێتەوە.

کۆمەڵگەی هیندیش بەشێکی زۆری هەمان سیمای پێوە دیارە، هەروەها وڵاتەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاش وەکو مالیزیا و ئەندەنووسیاش، نموونەیەکی باشن لە بنیاتنانی شوناسێکی پێشکەوتوو لەژێر سێبەری شۆڕشی زانیاری و زانستە مرۆییەکاندا کە کەشوهەوایەکی باشی بۆ پێکەوەژیان دروست کردووە، بەڵام لەم وڵاتانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، گرفتی بە ئایدۆلۆژیاکردنی شوناسە بچووکەکان لەئارادایە، کە زۆرتر باکگراوەندێکی سیاسی هەیە، نەك ئەو شوناسەی کە لەسەر بنەما ئایینی و نیشتمانی و نەتەوەییەکان دروست بووە.

مرۆڤ کائینێکی جوڵاوە و تێکەڵ بە ئەزموونی نوێ دەبێت لە شارستانیەت و کولتوورە جیاوازەکانی، بە هۆی پێشکەوتنی بەردەوامی راگەیاندن و هۆکارەکانی پەیوەندیش کاری تێدەکرێت و دەگۆڕێت و سلوك و بۆچوون و مامەڵەی جیاواز فێر دەبێت کە جیاوازە لەوەی کە لە شوناسەکەی خۆیدا هەبووە، مرۆڤی تازە جیاوازە لە مرۆڤی سەدەکانی رابردوو، بەجیهانیبوون کاریگەری لەسەر زەوق و شێوازی مامەڵە و رەوشتی دروست کردووە، شۆڕشی زانیاری و هۆکانی پەیوەندی مرۆڤیان بردووەتە ناو فەزایەکی نوێی ژیان، کولتوورەکان لەیەك نزیك دەبنەوە، فەلسەفە نوێیەکان دەچنە بواری جێبەجێبوونەوە، دەکەوێتە ناو تۆڕێکی ئالۆز لە کولتوور و بۆچوون و فیکر و رەوشت و مامەڵەی نوێوە، لەبەر ئەوە نابێت تاك بەبێ هیچ ستراتیژیەت و بەرنامەیەك بکەوێتە نێو شەپۆلەکانی ئەم دەریا نوێیە، چونکە ئەگەر هەر کۆمەڵگەیەك یان تاکێك

بەبێ بەرچاوڕۆشنی و ئامادەکارییەکی پێشتر بچێتە ناوی، ئەوا بەرەو چارەنووسێکی نادیار دەچێت، ئەگەر ببێتە هەڵگری شوناسێکیش ئەوە شوناسی ئەو نییە و ئەو تەنها دەبێتە پەراوێز و بێ سەنگ و کەسێکی بێ ئینتیما، جۆرێکی تر لە ئینتیما دروست دەکاتەوە کە خزمەت بە ئەوانی تر دەکات.

لەم زەمەنی بەجیهانیبوونەدا، دەبێت گۆڕاو و نەگۆڕەکانی شوناس دیاری بکرێن، پاشان لە ناوخۆوە بزاڤێکی رێنیسانس بنیات بنرێت بۆ گەشەپێدان، لە دەرەوەش بە شێوەیەکی ئیجابی لەگەڵ بەجیهانیبووندا مامەڵە بکرێت، بۆ ئەم وێنا تازەیەی شوناسیش دەبێت نموونەیەکی میانڕەوی کە تەعبیر لە رێگەی سێهەم بکات، بنیات بنرێت، واتە بیپارێزێت لە توانەوە و لەهەمان کاتدا لە پێشکەوتنە بەردەوامەکانی رۆژئاواش دوانەکەوێت و مامەڵەی ئیجابی لەگەڵدا بکات و کەناڵەکانی پەیوەندی لەگەڵ زۆر بکات و پەیڤینێکی شارستانی دروست بکات.

## شوناس و بەجیهانیبوون:

باسکردن لە شوناس لە ژێر سایەی بەجیهانیکردندا، جێگەی مشتومڕێکی زۆرە و پرسیاری زۆر دروست دەکات، چونکە پەیوەندی هەیە بە چارەنووس و دوارۆژی کۆمەڵگەکان و ئەو کولتوورانەی کە ئێستا هەن. ئایا چارەنووسی بە کوێ دەگات لە ژێر سایەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئێستا لە ئاستێکی فراوانی جیهانییدا روو دەدەن، کە هەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کولتووری دەگرێتەوە، قسەکردن لە پەیوەندیی نێوان بەجیهانیبوون و شوناس، واتە دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان بەجیهانیبوون و شوناس، دیاریکردنی ئەو پەیوەندییە چارەنووسسازەی کە بۆ گەلە ناڕۆژئاوایی یان نائەمریکییەکان دروست دەبێت.

ئایا ئەو پەیوەندییانە وەك خۆیان دەمێننەوە، یان هەرەس دەهێنن و لە ناو کولتووره جیهانییەکەدا دەتوێنەوە، کە جیهانیکردن پێشنیاری دەکات لە شێوازی جۆراوجۆردا.

(له نێوان چەمکی شوناس و بەجیهانیکردندا پەیوەندییەکی ئاڵۆز و پڕ له گێرمه و کێشه هەیه که زۆر تایبەته، له جۆری سروشتی پەیوەندی له نێوان چەمکەکان و شته جۆربەجۆرەکاندا دوو چەمکی یەکتر کێشکەرن و جەمسەردارن، لەهەمان کاتدا تەواوکەری یەکتریشن، له بازنەی ئەو جەمسەرگیری و کێشکردنەدا، چەمکی شوناس له زۆربەی کاتدا رۆڵی نێچیر و بەجیهانیکردنیش رۆڵی ڕاوچی دەبینێت)[٢٦].

لەم واقیعه ناهەموارەدا، شوناس دەگەڕێت له کەنارێکی ئارام، هەتا له ئەم ڕاوچییه فێڵبازه رزگاری ببێت، که بست به بست به دوای دەکەوێت و دەیەوێت هەڵیلوشێت، لێرەوه شوناس دەیەوێت رزگاری بێت و نەکەوێته داوی، بۆ ئەوەی له لەناوچوون و توانەوه پارێزراو بێت. بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین، که رۆژێك دێت ئەو دوانه بەیەك دەگەن، لێرەوه دەبێت قسه لەسەر دواڕۆژی ئەو بەیەکگەیشتنه بکەین که دەبێته مایەی دروستبوونی پەیڤینێکی گەرم لەنێوانیاندا، که ئەمەش رەهەندێکی جیهانیی وەردەگرێت و دەبێته کەرەستەی گفتوگۆی نوخبەی رۆشنبیران و بیرمەندان و سیاسییەکان لەسەر ئاستێکی جیهانیی، هەروەها دەبێته جێگەی مشتومڕ و لێدوان لەسەر ئاستی هاووڵاتیانی سادەش، چونکه هەموو پەیوەندییه کۆمەڵایەتییەکان به خێزان و پەروەردە کاریگەر دەبێت پێی و به جۆرێك له جۆرەکان گۆڕانی تیا دروست دەبێـت، ئەگەر سەیری کۆمەڵگه ناڕۆژئاواییەکان بکەین، دەبینین که ئێستا لەبارێکی ئاڵۆزدا دەژین، چونکه دامودەزگا تەقلیدییەکان کەوتوونەته بەر هێرشی بەجیهانیبوون و هەوڵ دەدرێت که ئایدۆلۆژیا و جیهانبینییەکی تر جێگەی بگرێتەوه و جۆرێك له نامۆبوونی تاك بەرامبەر شوناسه لۆکاڵییەکان دروست بکات.

لەبەر ئەوه دەبینین لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیی و کولتووری و شێوازی جلوبەرگ و خواردن گۆڕانی نەوعی دروست کردووە، که بەشێکی شتێکی ئاساییه و بەشێکه له سروشتی گۆڕانکاری له ژیانی مرۆڤدا، بەڵام بەشێکی تری زاڵکردنی جۆرێك له جیهانبینیی ترە، که جێگەی کولتووره لۆکاڵییەکه دەگرێتەوە.

[٢٦] خلف بشير، سؤال الهوية وصدمة العولمة.

بەشێك لە ئەو ترسەی لە کولتووره لۆکاڵییەکاندا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی ڕایەڵە کۆمەڵایەتییەکان و پێکهاتەی بنەما کولتووری و زانیارییەکان، لەبەر ئەوە بەردەوام لە ترس و دڵەڕاوکێدا دەژی و توانای بەرەوڕووبوونەوەی کولتووره جیهانییەکەی نییە.

هەرچەند بنەمای کولتووری و زانیاریی کۆمەڵگەیەك لاوازبێت، ئەوەندە هەست بە مەترسی دەکات لە بەرامبەر کولتووره جیاوازەکان و هەر ئەمەشە کە تاك بە ئاسانی هەرەس دەکات و بەرگرییەکی ئەوتۆی نییە کە خۆڕاگرێت لە بەرامبەر کولتووره جیهانییەکەدا، (یەکێك لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەی کە بوونەتە هۆی ئەوەی شوناس و کولتووره جیاوازەکان هەست بە مەترسی بکەن، ترسە لەو هەژموونەی کە لە باکگراوندی فیکری و سیاسی و کولتووریی هێزە جیهانییە نوێیەکاندا هەیە، کە پانتاییەك ناهێڵنەوە بۆ ڕێز و پاراستنی بەها و ئایین و جیاوازیی، بەڵکو دەیانەوێت مرۆڤەکان بە شێوەیەکی نوێ دابڕێژنەوە بەپێی ئەو قاڵبە تازەیەی کە بۆیان دروست کردووە، کە تایبەتە بە پێوەرەکانی خۆیان، هەوڵی ئەوە دەدەن کە شوناسێکی نوێ دابڕێژنەوە کە فەرزی دەکەن بە سەر واقیعە مرۆییەکەدا، کە ئەمەش لە چوارچێوەی ڕێکەوتنێکی سەربازی و ئەمنیدایە کە پشت بە بەکارهێنانی هێز دەبەستێت)[٢٧].

ئەمڕۆ لە جیهاندا گۆڕانکاریی گەورە دەبینین کە هەموو بوارەکانی مەعنەوی و ماددی و فیکری و ژینگەیی دەگرێتەوە. ئێستا ئێمە لەدایکبوونی جیهانێکی نوێ دەبینین، کە زانست و زانیاری و تەکنەلۆژیای نوێ ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن، ئەم گۆڕانکارییانەش لایەنی سایکۆلۆژی و فیکری مرۆڤ دەگرێتەوە، کە تیایدا ئەو پەیوەندییەش دیاری دەکات کە بە ئەوانی ترەوە دەیان بەستێتەوە، بەتایبەتیش جیهانی ڕۆژئاوا، واتە ئێمە لێرەدا لەدایکبوونی کولتوورێکی نوێ دەبینین، ئێستا هەست دەکەین لە جیهانێکی تازەداین کە هەڵگری ئاڵای کولتوورێکی نوێیە، ئەم کولتوورە بەرهەمهێنە و گەشە دەکات و پەخش دەبێتەوە و پەیامەکەی خۆی لە

---

[٢٧] عبدالعزيز عثمان التويجري، العالم الاسلامي في عصر العولمة، دار الشروق، القاهرة، ٢٠٠٤، ص٥٥.

پێشکەوتووترین هۆکانی راگەیاندندا دەگەیەنێتە هەموو جیهان، بەجیهانیکردنی کولتوور دابڕاو نییە لە بوارەکاتی تری بەجیهانیکردن، بەڵکو هەریەکەیان کاریگەری بۆ سەر ئەوی تریان هەیە، بەتایبەتی ئابووری کاریگەری زۆری لەسەر بوارەکانی تر هەیە، دواجار ئەو کولتوورە لۆکاڵییە دەگەشێتەوە یان بەرەو پووکانەوە دەڕوات، چونکە ئابووری کاریگەری هەیە لەسەر کەسایەتی و گەشەپێدان، ئەمەش بە جۆرێك لە جۆرەکان کاریگەری لەسەر کولتوور هەیە، چۆنیەتی پەیوەندیی ئابووریش لە نێوان پاشکۆیی و سەربەخۆییدا چارەنووسی شوناس دیاری دەکات. واتە ئاستی گەشەی ئابووری لە هەر وڵاتێکدا کاریگەری هەیە بۆ سەر شوناسی ئەو گەلە، چونکە سیاسەتیش لە دواییدا پابەند دەبێت بە ئاستی گەشەی ئابووری و ناتوانێت لە کاریگەرییە سلبی و ئیجابییەکانی پارێزراوبێت.

بە ڕای دکتۆر موحەممەد عابد ئەلجابری: (بەجیهانیکردن دەبێتە مایەی سەپاندنی هەژموون و خۆبەدەستەوەدان لە میکانیکیەتی گەشەی شارستانیدا، کە ئەمەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی هەستی ئینتیما بۆ نیشتمان و گەل و دەوڵەت.

هەروەها دەبێتە مایەی خاڵیبوونەوەی شوناسی کولتووری لە هەموو ناوەڕۆکێك، بەجیهانیبوون واتە جیهانێك کە دەزگا و تۆڕە جیهانییەکان رابەرایەتی دەکەن.

جیهانی (بکەرەکان) کە ئەوان خاوەن ئاراستە و دەسەڵاتن، (کارتێکراوان) کە بەکاربەری شمەك و وێنە و زانیاری و جوڵەکانن کە بە سەریاندا فەرز دەکرێت، نیشتیمانیشیان گەردوونی (زانیارییە) کە تۆڕەکانی پەیوەندی دیاری دەکەن، ئەو گەردوونەی دەبێتە ئاراستەکەری ئابووری و سیاسەت و کولتوور)[٢٨].

ئەگەر سەرنجی تیۆری ململانێی شارستانییەکانی "سمۆیل هانتینگتۆن" بدەین، دەبینین خوێندنەوەیەکە بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵێك ناکۆکی و ململانێ کە پاڵنەری یەکەم تیایدا شوناسە، واتە شوناس لەزەمەنی بەجیهانیبووندا دەبێتە رەگەزێکی کاریگەر لە کولتووری گەلاندا.

---

[٢٨] د. محمد عابد الجابري، العولمة والهوية الثقافية، عشر أطروحات في كتاب (العرب والعولمة)، ص٣٠٣.

بەتایبەتی گەلە خاوەن شارستانیەت و ئایینە گەورەکان کە وا بە ئاسانی ملکەچی ویست و هەژموونی بەجیهانیبوون نابن و ئامادە نین کە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانیان واز لێ بهێنن و قبووڵی شوناس و کولتوورێکی تر بکەن، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ ئێمە جۆرێك لە بەرگری و کاردانەوە دەبینین، هەر چەند لە دیوێکی تریشەوە دەیان کۆنگرە و کۆنفرانسی ناوچەیی و جیهانی دەبەسترێت بۆ پەیڤین و لەیەکترگەیشتن و راگۆڕینەوە.

هانتینگتۆن لە تیۆرییەکەیدا دان بەو راستییەدا دەنێت کە: "ئەمڕۆ جیهان رووبەڕووی قەیرانێکی گشتیی شوناس بووەتەوە، هەموو گەل و نەتەوەکان دەیانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە، ئێمە کێین؟".

بۆ ئەم مەبەستەش دەگەڕێنەوە بۆ خۆشەویستترین شت لایان کە باپیران و ئایین و زمان و مێژوو، ترادسیۆن و دەزگاکانیانن، هەروەها خۆیان گرد دەکەنەوە لە کۆمەڵی کولتووری، لە شێوەی هۆز و گرووپی نەتەوەیی و کۆمەڵی ئایینی، دواجاریش لە شێوەی شارستانیەتێکدا[٢٩].

ئەمڕۆ تەعبیرکردن لە فیکری نەتەوەیی لە قاڵبی پێناسە تەقلیدییەکەیدا جیاوازە و ناگەڕێتەوە بۆ ئەفسانە و مێژوو و کاریزمای سەرکردەکان، بەڵکو زۆرتر خۆی دەداتەوە پاڵی کولتوور، لە رێگەی شوناسیشەوە، دەیەوێت وێنای سەربەخۆیی و مانەوەی نەتەوە بپارێزێت.

لە ئێستادا جۆرێك لە یەکگرتن و نزیکبوونەوە و پێکهاتنی کوتلەی جیاواز دەبینرێت، لەبەر ئەوە تەنها نەتەوەیەك بە جیا ناتوانێت لەبەردەم شاڵاوە بەتینەکانی بەجیهانیبووندا خۆی بگرێت.

یان بە نمایشکردنی چەند وێنەیەکی تەقلیدیی لە ترادسیۆن وێنایەکی نوێ بۆ خۆی دروست بکات و پارێزراو بێت لەبەردەم گۆڕانە خێرا و کتوپڕە جیهانییەکەدا،

---

[٢٩] خميس عبداللطيف، الهوية الثقافية بين الخصوصية وخطاب العولمة الهيمني: (www.fikrwanakd.aljabriabed.net).

بەڵکو نەتەوە دەبێت لە نمایشی ترادسیۆنەوە بچێتە قۆناغی بەرهەمهێنانی کولتوور، کە ئەویش نابێت دابڕاوبێت لە مێژوو و کولتوور و ئایین و شارستانیەت، بەڵکو دەبێت لە مێژووەوە سەرچاوە بگرێت و بچێتە ناو شارستانیەت و مەدەنیەتی نوێوە، لەلایەکی تریشەوە دەبێت شارستانیەت ببێتە بازنەی کۆکردنەوەی ئەو نەتەوانەی کە سەر بە هەمان شارستانیەتن، هەتا لەم رێگەیەوە بتوانێت هێزێکی زیاتر مەعریفی و فیکری بەخۆی بدات و بە جیهانبینییەکی بەهێزەوە بچێتە مەیدانی ململانێ، واتە لێرەوە دەبێت سەرەتا بگەڕێین بە شوێن پێناسی نەتەوەدا و بە رووی ئایین و شارستانیەت و جوگرافیای زمانی خۆی دیاری بکات. پاشان لەبەرامبەر ئەوانی تردا وێنای خۆی بکات.

سەرەتا دەبێت ئێمە دان بەوەدا بنێین کە جیاوازین، ئاگاداری ئەوەش بین کە بە بەرائەتەوە سەیری ئەوانی تریش نەکەین، چونکە ئەمڕۆ کولتووری باشوور بەرەوڕووی هەژموونی کولتووری باکوورییەکان بووەتەوە، بەتایبەتی لە بواری ئەخلاق و بەها مرۆییەکاندا، چونکە ئەوان نایانەوێت لە ئەخلاق و بەهای گەلانی تر تێبگەن.

ئەوان نایانەوێت دان بە بوونی شارستانێتییە جیاوازەکاندا بنێن، بەڵکو بەشێوەیەکی ئەکادیمی و نەخشەبۆکێشراو لەسەر لاوازکردن و بێبایەخکردنی کولتوور و شارستانیەتەکانی تر کار دەکەن و دەیانەوێت رۆژئاوا بکەنە سەنتەری عەقڵانیەت و شارستانیەت و مەدەنیەت و دیموکراسی و ئەوانی تریش بکەنە پەراوێز و پاشکۆی خۆیان، ئەم خوێندنەوانە زۆرجار نەك بۆ ئێستا، بەڵکو بە مێژوودا شۆڕ دەبنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ فەلسەفەی یۆنان و رۆمان و هەموو شارستانییەکان بە درێژکراوەی خۆیان دەزانن، ئەمەش خوێندنەوەیەکە بەڕوونی لە بۆچوون و نووسینەکانی رۆژهەڵاتناساندا دەبینرێت و تەنانەت لە ئێستادا لە زۆر زانکۆ و ناوەندی ستراتیژیی رۆژئاواییدا بوونی هەیە، کە ئەمەش درێژکراوەی عەقڵێکی ئیمپریالیستیی ئاینیی مێژووییە، کە خۆی لە پیرۆزکردنی خۆیدا دەبینێتەوە و لە بەشەیتانکردنی بەرامبەرەکاندا، بەڵام دەبێت لەوەش بەئاگا بین، ئەگەر بەشێك لەلایەنی لاوازیی

وێناکانی شوناس و کولتوور ئەمە بێت، بەشێکی تری دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی کەرەستە و هۆکار و بنەماکانی پێکهێنە شارستانییە نوێکانی نەتەوە لە دامودەزگا سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکان.

واتە لەم بوارە نوێیەدا کە فراوانبوونێکی گشتی هەیە بۆ پەیوەندی و پەیڤین و خۆناساندن و گفتوگۆی شارستانییانە و فەزایەکی رەخساو هەیە بۆ خۆنواندن و خۆناساندن، بەڵام ناتوانێت وەك پێویست بوونی خۆی بسەلمێنێت و وا نیشان بدات کە نەتەوەیەکی بەرهەمهێنە و دەتوانێت عەقڵانیەت و شارستانیەت و مەدەنیەت بەرهەم بهێنیت.

لەبەر ئەوە روویەکی تری بەجیهانیبوون روویەکی ئیجابییە، چونکە لە رێگەی ناسین و بینینی بەرامبەرەکان، تێدەگەیت کە تۆ چیت و لە چ ئاستێکی پێشکەوتنداین، یان ئایا دەتوانیت لە رێگەی پەیوەندییە کولتوورییەکانەوە پرۆژەیەك بۆ گۆڕان بنیات بنێیت، چونکە گۆڕانی کولتووری و کۆمەڵایەتی لە چەند رێگەیەکەوە دەبێت، لەوانەش:

١. وەرگرتنی کولتوور، وەك رەگەزێکی پێشکەوتن لە کۆمەڵگەکانی تر کە خاوەن کولتوورێکی بەهێزن.

٢. زیادکردنی رەگەزێکی کولتووریی یان ریفۆرمی کولتووریی لە رێگەی داهێنان و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە.

٣. هەوڵدان بۆ هێنانی رەگەزی نوێی کولتووریی، چونکە ئەو پێکهێنەرە کولتوورییانەی کە ئێستا هەن توانای مانەوە و بەرگرییان نییە و دەبێت بەشێوەیەکی نوێ دارشتنەوەیەکی تر بۆ کولتوور بکرێت کە کاریگەر بێت بە پێشکەوتنە جیهانییە نوێیەکە.

لەبەر ئەوە دەبێت نوخبەی رۆشنبیری و سیاسیی لە فیکری ئەوەدا بن کە خۆیان پرۆژەی رۆشنبیرییان هەبێت بۆ گۆڕان، ئەوەش بدرێتە هەموو دامودەزگاکانی حکومەت و ناحکومییەکان بە تایبەتیش راگەیاندن، کە بەهۆی زۆر دووبارەبوونەوەوە

ببێته سلوكێكی كۆمەڵایەتی، بەمەش دەتوانی رێگە لە توانەوەی شوناس بگری و شوناسێكی نویٚ بەرهەم بهێنیت كە جێگەی رەزامەندیی تاك و گرووپە جیاوازەكانی كۆمەڵگە بێت.

كاتێك ئێمە باس لە گۆڕان دەكەین، دەبێت بزانین گۆڕانی سلبی و ئیجابی چییە؟ كاتێك كە كۆمەڵگەیەك روو لە گۆڕان دەكات بەبیٚ بوونی هیچ پرۆژە و بەرنامەیەكی پێشوەخت.

ئەوە بزانە كە یان كۆمەڵگە بەرەو جۆرێك لە هەرەس دەبات، یان لە شوێنێكەوە ئاڕاستە دەكرێت كە دواجار بە ئیجابی ناشكێتەوە، بەڵكو بەرەو ئاستێك هەنگاو دەنێت، كە رووە و پەراوێزبوون و پاشكۆیی و لەدەستدانی سەربەخۆیی دەچێت، لە هەموو بوارەكانی كولتووری و ئابووری و سیاسیی، ئێمە دەبێت كە باس لە گۆڕان دەكەین، گۆڕانێكی ئامانجداری نەخشەبۆكێشراو بێت، لەسەر بنەمایەكی مرۆیی خزمەت بە ئایندەی نیشتیمان و نەتەوە بكات. واتە پرۆژەیەك بێت بۆ بەگەڕخستنی تواناكانی تاكی كۆمەڵگە و ئاڕاستەیەكی ئیجابی پێبدات بۆ گەشەدان بە ڕەوشی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی، ئەمەش ئەمڕۆ ناسراوە بە گەشەپێدانی مرۆیی.

دكتۆر موحەممەد حەنەفی دەڵێت: (شوناس بریتییە لە هەموو پێكهێنەرە بەهێزەكانی تایبەتمەندییە لۆكاڵییەكان لە ڕووی ئابووری و سیاسی و كۆمەڵایەتییەوە، كە دەشێت:

١ـ ببێتە بەشێك لە چوارچێوەی بەجیهانیكردن، ئەویش بە حوكمی پاشكۆبوون و ڕازیبوون بە ڕێنماییەكانی دەزگا داراییە مۆنۆپۆڵە نێودەوڵەتییەكان، وەك سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانكی دەولی و ڕێكخراوی بازرگانیی جیهانیی، كە هەموو وڵاتانی هاوكاریكراو ناچار دەكات بۆ جێبەجێكردنی مەرجەكانی لە بوارەكانی ئابووری و سیاسی و كۆمەڵایەتیدا.

٢- یان دەبێتە بەشێك لە دامودەزگا جیهانییەکان، ئەویش بەهۆی توانەوە و پابەندبوونی تەواو بە مەرجەکانیان و بە تەواوی تێکەڵبوون لەگەڵیاندا، بە جۆرێك کە هەمان چارەنووس لەخۆ دەگرێت.

٣- یان دەبێتە نێچیری بەجیهانیبوون و دەیخاتە ناو هەناوی خۆی و بەزۆر دەیتوێنێتەوە و گوێ بە هیچ ویست و ئیرادەیەکی نادات.

٤ـ یان دەکەوێتە ململانێ لەگەڵیدا و لە هەوڵی گەشەدان بە بەرهەڵستکارییدا دەبێت و بەرگری لە مانەوەی خۆی دەکات(٣٠).

کولتووری رۆژئاوایی لە زەمەنی بەجیهانیبووندا، فەزایەکی ئازاد دروست ناکات بۆ کولتوورەکانی تر لەپێناو گفتوگۆ و لەیەکتری گەیشتندا، هەتا بگەڕێن بە شوێن باشترین بەهای مرۆیی شارستانیدا، بەڵکو دەیەوێت کە کۆمەڵگەیەکی بەکاربەری جیهانی دروست بکات کە پێی دەڵێن (کۆمەڵگەی بازاڕی گەردوونی) بۆ ئەم مەبەستەش هەموو هۆکارە تەکنەلۆژییە پێشکەوتووەکان لە بیستراو و بینراو و نووسراو بەکاردەهێنێت، کار لەسەر بەهاکانی کۆمەڵگە ناڕۆژئاواییەکان دەکات لە رێگەی گەردوونەوە، نەك لە رێگەی گفتوگۆ و کۆنفرانسەکان، لەم رێگەیەوە رۆژئاوا تەکنەلۆژیای نوێ ئیستغلال دەکات، بۆ کێشانی وێنەی شوناسی داهاتوو، لەمجۆرە بۆچوونەشدا هەموو تایبەتمەندییە ئاینی و زمان و کولتووری و نەتەوەیی و هۆزایەتییەکان دەخاتە ژێر هەژموونی خۆی و سنوورداریان دەکات و ملکەچ دەکرێن بۆ ئالیەتی بازاڕ و بەکاربردن و سەرمایە.

شێوازی کاردانەوە و هەڵوێستی نەتەوە جیاوازەکان بەرامبەر بەجیهانیکردن دەگۆڕێت، بەپێی باری پێشکەوتنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەتایبەتیش شێوازی بەشداری و ئاستی پەیوەندییە جیهانییەکان لە تەکنەلۆژیا و ناوەندەکانی ئەکادیمی و راگەیاندن و ئاستی گەشەی ئابووریی.

---

[٣٠] د. محمد حنفي، الهوية والعولمة.

نەتەوەی کوردیش وەك بەشێك لە نەتەوە ڕۆژهەڵاتییەکان و مسوڵمانەکان، کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بەجیهانییکردن، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین ئاستی کارلێکردنەکە خێرا و کتوپڕ و هەمەلایەنەیە، چونکە لەلایەك کورد خاوەنی دەوڵەت نییە، کە ئەمەش جۆرێك لە ناڕۆشنیی بەرنامە ستراتیژییەکانی دەخاتە ڕوو، لەلایەکی تر دەرگاکانی بێ سانسۆر ئاوەڵایە لەبەردەم کۆمپانیا و ڕاگەیاندن و ڕێکخراوە سیاسی و ئەمنییەکانی ڕۆژئاوا، کە ئەمەش جۆرێك لە مەترسی بۆ ئایندە دروست دەکات، چونکە گۆڕان لە کوردستاندا بە بەرنامە نییە و دواجار ناچێتە خزمەت شوناسی کوردبوون و کوردستانیبوونەوە.

ئەم کاریگەرییە تایبەت نییە تەنها بە گەلە مسوڵمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، بەڵکو گەلە ڕۆژهەڵاتییە نامسوڵمانەکانیش کە لە بازنەی ڕۆژئاواییەکاندا هەڵسوکەوت دەکەن، وەك ژاپۆن و کۆریای باشوور و تەنانەت چینیش، جۆرێك لە بێزارییان پێوە دیارە لەبەردەم شاڵاوی کولتووری ڕۆژئاوادا، بۆ نموونە لەو لێکۆڵینەوە مەیدانییانەی کراوە بۆ زانینی کاریگەریی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی ئەمریکی لەسەر گەنجەکانی کۆریای باشوور کە (Morgan kanga) پێی هەستاوە، ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوە ئەوە ڕادەگەیەنن کە تەلەفزیۆن و فلیمە ئەمریکییەکان کاریگەریی زۆریان دروستکردووە لەسەر گەنجە کۆرییەکان.

ئێستا کچە گەنجە کۆرییەکان هەست دەکەن زۆرتر خۆیان بە ئازاد دەزانن و کەمتر پابەندی بەها ئەخلاقی و خێزانییەکان دەبن و پێیان وایە کە مومارەسەکردنی سێکس بەبێ دروستکردنی خێزان و شووکردن شتێکی ئاساییە و مایەی نەنگی نییە، ئەمەش بە بەشێك لە ئازادییەکانی سێکس دەزانن، ئێستا کچەکان جلوبەرگ و مۆدێلی ئەمریکی دەپۆشن و ڕقیانە لە بیروباوەڕی کۆنفشیۆسی[٣١].

---

[٣١] د. عمار طالبي، العولمة وأثرها على السلوكيات والاخلاق، مجلة الرائد، تصدر عن الدار الاسلامية للإعلام، العدد: ٢٣٦، مايو ٢٠٠٠، ص١١.

ئەم ترسە نەك هەر ڕۆژهەڵاتییەکانی گرتۆتەوە، بەڵکو ئێستا هەندێك وڵاتی گەورەی ئەورووپی وەك فەرەنسا کە خاوەنی شارستانیەتێکی مێژوویی خۆیەتی و لە ئێستاشدا یەکێکە لە وڵاتە زلهێزەکانی ئابووری و سیاسی و لە هەمان کاتدا وڵاتێکی مەسیحییە، بەڵام بەهۆی جیاوازیی زمانەکەیەوە ئێستا یەکێکە لەو وڵاتە ڕۆژئاواییانەی کە زۆرترین نیگەرانی دەردەبڕن لەئاست بەجیهانیکردنی کولتوور و هەژموونی زمانی ئینگلیزیی، لە بەرامبەر ئەمەشدا ترس دایگرتووە لە ئایندەی شوناسی فەرەنسی، لەبەر ئەوە فەرەنسییەکان شوناسی فەرەنسی دەخەنە خانەی شتە تایبەتییەکان، چونکە ئەوان لەو بڕوایەدان کە هێزی بەرهەمهێنانی کولتووری ئەمریکی بەپێی بەرنامەیەکی قۆناغدار دەبێتە هۆی دروستکردنی گۆڕانکاری لە پێوەر و ئەخلاق و شێوازی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە[٣٢].

هەروەها توێژینەوەیەکی تر هەیە لە ئوسترالیا کە ئەویش وڵاتێکی ڕۆژئاوایی مەسیحییە و بە زمانی ئینگلیزیش قسە دەکەن، واتە هەڵگری هەمان شوناسی ئەمریکاییە لە ڕووی زمان و ئایین و شارستانیەتەوە، نیگەرانە لە کاریگەرییەکانی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی ئەمریکی لەسەر منداڵانی ئوسترالیا، چونکە دەبێتە هۆی نەمانی ئینتیما و قەیرانی ئەخلاقی و نامۆیی کولتووریی[٣٣].

هەروەها کەنەدا نیگەرانییەکانی خۆی لەسەر زمانی وەزیری ڕۆشنبیری (شیلاکۆبی) ڕاگەیاند، کە نیگەران بوو لە هەژموونی کولتووری ئەمریکی و دەستتێوەردانەکان و وتی:

یەکێك لە مافەکانی منداڵانی کەنەدی ئەوەیە کە گوێ لە حیکایەتی باپیران بگرن، ئەوە مەعقول نییە کە (٦٠٪)ی بەرنامە تەلەفزیۆنەکانی کەنەدا لە دەرەوە بێت و (٧٠٪)ی مۆسیقاکانمان هی بێگانە بێت و (٩٥٪)ی ئەخلاقمان ئەمریکی بێت.

---

[٣٢] هەمان سەرچاوە، ل١٢.

[٣٣] هەمان سەرچاوە، ل١٢.

له فۆرمه گشتییەکەیدا کولتوور و شوناسی کوردیی دابڕاو نییه له کولتووری گەلانی مسوڵمان، چونکه ئەگەر کورد خۆیشی خوێندنەوەی جیای هەبێت، رۆژئاواییەکان بەتایبەتی ئەمریکییەکان هەروەك گەلێکی مسوڵمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن و جیای ناکەنەوە، لەبەر ئەوە ئێمه دەبێت لەم روانگەیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەوی تری رۆژئاوایی بکەین، ئەگەر سەیری وێنەی مرۆڤی مسوڵمان بکەین له روانگەی راگەیاندنی رۆژئاواییەوە مرۆڤێکی ئاسایی و یەکسان نییه به مرۆڤی سپی، بەڵکو دەبینین بەردەوام خوێندنەوەیەکی جیاواز هەیه و له ڕووی ئایین و زمان و شارستانیەتەوە، ئەمەش بەردەوام له نەزعەیەکی ئیمپریالی و پاشکۆیی و دواکەوتنەوه سەیری دەکات و به شێوەی یەکەیەکی مرۆیی خاوەن شارستانیەت و مێژوو نایخوێنێتەوە.

بەجیهانیکردن هەوڵ دەدات که سەر له نوێ چەمك و تێڕوانینەکان و جیهانبینی مرۆڤ بگۆڕێت بەرامبەر به گەردوون و مرۆڤ و ژیان و ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر ئەخلاق و مامەڵە و شێوازی ژیانی مرۆڤی مسوڵمان، له جێگەی ئەمانەدا برەو بدات به چەمك و جیهانبینی رۆژئاوا دەربارەی ئەو بابەتانەی که باسمان کردن.

له دیدی بەجیهانیکردنی کولتووری و فیکرییەوە گەردوون بۆ ئەوە دروست نەبووە که بخرێته ژێر رکێفی مرۆڤەوە، یان ببێته گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی خەڵك که ئایا کێیان باشترین کردەوه ئەنجام دەدەن!! لەلای ئەوان مرۆڤ بۆ خواپەرستی دروست نەبووە، له کاتێکدا که ئەم چەمکانه بنەمای عەقیدەی ئیسلامین، بەڵام له دید و تێڕوانینی بەجیهانیبوونی فیکری و کولتوورییدا ئەمانه بێجگه له ئەفسانه هیچی تر نین[٣٤].

کاریگەریی بەجیهانیکردن لەسەر شوناسی کولتووریی، ئێستا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، وەك زەمەنی پێشوو نییه، چونکه ئەم کاریگەرییه له رێگەی داگیرکارییەوە

---

[٣٤] هەمان سەرچاوە.

نییه، بەڵکو پشت دەبەستێت بە چاندنی چەمکی فیکری و کولتووریی نوێ، کە لە شێوەی بەکاربردنی ئابووری و لەزەت وەرگرتنەوەیە.

هەر بەم هۆیەوە ئەمڕۆ دەبینین کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا ئاستی گرنگیدان بە تایبەتمەندییەکان و شتە بۆماوەییەکان و مەعنەوییەت لە کەمبوونەوەدایە و ئێستا زمانی ئینگلیزی بووەتە زمانی فەرمی لە زانکۆکانی جیهانی ئیسلامیی و تەنانەت بووەتە زمانی دایك بە پلەی دووەم، بەجیهانیکردن هەوڵ دەدات کە هاووڵاتیان پەیوەست بکات بە جیهانێکی (بێ نەتەوە) و (بێ خاك) و (بێ دەوڵەت)، چونکە ئەمە سەرەتای هێنانەدی خەونە ڕۆژئاواییەکانە و ئەوکاتەش پرۆژە کولتوورییەکە دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە و شوناسە جیهانییە نوێیەکە کە شوناسی بە ئەمریکایی بوونە، بە پلەی یەکەم جێگەی خۆی دەگرێت.

لەگەڵ پیشکەوتنی تەکنەلۆژیا و تەکنیکی نوێدا، کە توانیویەتی بچێتە ناو هەموو بوارەکانی ژیانەوە، بەم هۆیەوە شوناسی نیشتیمانیی هەموو کۆمەڵگەکان لە مەترسی سڕینەوە و لەناوچووندایە، چونکە ئەم پێشکەوتنە لە جەوهەردا هەڵگری مەعریفە و زانستی نوێیە، بە ئاڕاستەیەك هەنگاو دەنێت کە ئامانجی گۆڕینی پێکهاتەی باوەڕ و شارستانیەتی گەل و نەتەوە جیاوازەکانە، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کە گرنگی بە شوناسی شارستانی و نیشتیمانی بدرێت و جەخت لەسەر نەگۆڕەکانی بکرێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی ئیجابی مامەڵە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا بکەین و بەپێی توانا دووربکەوینەوە لە هەموو ئەو نەخشە و پلانە ستراتیجیانەی کە دەبنە هۆی پەرتبوون یان ناشیرینبوونی شوناسی نیشتیمانی.[٣٥]

ئێمەی گەلی کوردیش کە بەشێکین لە گەلانی دنیای ئیسلام، پێویستە هەماهەنگیمان لەگەڵ گەلانی ناوچەکەدا هەبێت و هەنگاوی بۆ هەڵبگرین، چونکە ئیسلام بریتییە لە بنەمای پێکهاتەی شارستانیەت لەلای مسوڵمانان، هەر بەم

---

[٣٥] هەمان سەرچاوە.

هۆیەشەوە ئێستا سەرچاوەی سەرەکییە بۆ شوناسی نیشتیمانی و نەتەوەیی، هەر لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانرێت شوناسە نیشتیمانی و نەتەوەییەکان پارێزگارییان لێ بکرێت.

ئیسلام بە بیر و باوەڕ و شەریعەت و مێژوو شارستانیەتەکەی و زمانەکەی بریتییە لە شوناسێکی هاوبەش بۆ هەموو مسوڵمانێك، هەروەها ئەو زمانەش کە قسەی پێ دەکات تەنها هۆکارێکی تەعبیر و گوتاردان نییە، بەڵکو فیکر و خود و ناونیشانە، پیرۆزییەکی تایبەتی هەیە کە لە ئاسمانەوە هاتووە، هەورەها ئەو جیهانبینییەی کە بڕوامان پێ هێناوە تەنها ئایدیۆلۆژیایەك نییە، بەڵکو زانستێکە تەواو گشتگیرە، هەروەها سروشتی ئاسمان و ڕێگایەکی ڕاستە، ڕاستییەکی بێگومانە کە هیچ گومان و ناتەواوییەك هەڵناگرێت، مەنزومەیەکی بەهاکانە بووە بە مەرجەعمان لە سلوك، ئەمەش نە ڕێژەییە و نە قۆناغێکە.[٣٦]

لەکاتێکدا کە باس لە چارەنووسی شوناس و گۆڕانکارییەکانی دەکەین، نابێت بەشێوەیەکی سادە تێکەڵاو بەم بابەتە ببین، چونکە بەبێ ناسینی بەرامبەر و رایەکانی و ئامانجەکانی، نابێت ئێمە هەڵوێستی خۆمان دیاری بکەین، دەبێت ئێمە ئەوە ببێتە قەناعەتێکی دامەزراو لامان کە ڕۆژئاواییەکان وەك گەلێکی مسوڵمان مامەڵەمان لەگەڵدا دەکەن و تێڕوانینێکی تایبەت نییە بۆ ئێمە، لەبەر ئەوە، ئێستا ئێمە دەبینین کە ڕۆژئاواییەکان لە هەوڵی پەراوێزخستنی کولتووری ئیسلامیدان، ئەمەش لەلای ئەوروپی و ئەمریکییەکان وەك یەك و بە دیدێکی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی شتەکان دەخوێننەوە، لەم هەڵوێستەشیاندا ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی سەرنجی بدەین، بێئاگایی و نەزانییەکی زۆریان پێوەدیارە دەربارەی ئیسلام و مسوڵمانان، ناشیانەوێ تێبگەن لە ئیسلام و شارستانیەتی ئیسلامیی، ئەم نەناسین و نە شارەزاییانەیان و خوێندنەوەیەکی سەرپێیی ڕووکەش و ڕۆژنامەنووسییانە وایکردووە کە خۆیان وەك دوژمنێك سەیر بکەن، واتە جەنگێکی کولتووری و شارستانییان دەستپێکردووە، ئەویش بەهۆی جیاوازی نموونەی شارستانی و مەرجەعیەت، چونکە ئەوان لە فیکری

[٣٦] د. محمد عمارة، مفاصل العولمة على الهوية الثقافية، ص٤٦.

پێکەوەژیانێکی مرۆییدا نین، بەڵکو بە عەقڵیەتێکی هەژموونگەرایی مامەڵە دەکەن، کە گرنگترینیان بەرۆژئاواییکردنی کولتووری نیشتیمانی و نەتەوەیی و ئاینییە، ئەویش لە رێگەی کۆمەڵێك دامودەزگای بەهێزی سەرنجڕاکێشی وەك هۆکارەکانی راگەیاندن و تەکنەلۆژیای نوێ و دەستبەسەرداگرتنی، لەسەر ئاستی مەعریفە و بەکارهێنانی، بەرهەمهێنانەوەی کولتوور رۆڵێکی گرنگی لەم بوارەدا هەیە، کە ئەویش لەسەر شێوازێکی نوێیە کە بە پۆست مۆدێرنیزم ناودەبرێت، کە ئەمەش بەرهەمهێنانەوەی نوێیە و چەمکی بەکاربردن بەهێز دەکات لەلای گەلان. هەروەها ڕایەکی تریش هەیە، کە دەڵێت کولتووری تەقلیدیی ناتوانێت لەبەردەم شەپۆلەکانی کولتووری بەجیهانیکردندا خۆی بگرێت، لەم حاڵەتەشدا شوناس دەکەوێتە بەردەم لەناوچوون و توانەوەوە، چونکە بەجیهانیکردن دێت جارێکی تر سەر لە نوێ شوناسی نەتەوەیی و نیشتیمانی دادەڕێژێتەوە، ئەویش لە ژێر کاریگەریی تەکنەلۆژیا و راگەیاندن و پەیوەندییە نوێیەکاندا دەبێت، لەکاتێکدا کە پرۆژەیەکی نیشتیمانی و نەتەوەیی لەئارادا نەبێت کە لەسەر بنەمایەکی کولتووریی زانستیی پتەو داڕێژرابێت، ئەوا ئەوکاتە شوناسی ئەو نەتەوەیە دەکەوێتە بەردەم شەپۆلەکانی بەجیهانیکردنی ئەمریکییەوە و دەبێت بە کولتوورێکی پاشکۆ و پەراوێز و شکستخواردوو، هەروەك ئەمڕۆ دەبینرێت کە چۆن بەئاسانی کولتووری بەکاربەری ئەمریکی چۆن چووەتە ناوکرۆکی دامودەزگا نیشتیمانییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بە کولتوورەوە هەیە، وەك پرۆگرامەکانی خوێندن و زانکۆ و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە، کە هەموویان ئەو راستییە دەسەلمێنن (دەربارەی چارەنووسی شوناس لە زەمەنی بەجیهانیکردندا رای جیاواز هەیە، هەندێکیان باوەڕیان وایە کە رێگەیەکە بۆ ئازادی و کرانەوە و ڕزگاربوون لە لایەنگریی کوێرانە بۆ ئایدۆلۆژیایەك و کرانەوە بە ڕووی فیکری جیاواز بەبێ رەگەزپەرستی و خۆشڵەژاندن، هەروەها رێگەیەکە بۆ ڕزگاربوون لە هەموو ناعەقڵانیەتێك کە بەهۆی لایەنگریی پێشوەختە دروست بووە بۆ ئایین یان

ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو، لەدوای ئەمەش عەقڵانیەتێکی زانستی و بێلایەنی کولتووریی بنیات دەنێت)[٣٧].

بەپێی ئەم رایە (بەجیهانیبوون هەڕەشەیەك نییە بۆ تواندنەوە یان لەناوبردنی شوناسە کولتوورییەکان، بەڵکو بە جۆرێکی تر دروستیان دەکاتەوە، تەنانەت گەشەیان پێدەدات کە لەگەڵ ئێستا بگونجێن، ئێستا مرۆڤ بەرەو ئەوە دەڕوات کە هەڵگری چەند شوناسێك بێت، نموونەشمان بۆ ئەمە کۆچبەرەکانن، بەتایبەتیش بەرەی سێهەمیان، ئەمانە نابێـت وەك رابردوو باسیان بکرێت کە بە مرۆڤی پەراوێز یان دوالیزمە ناو دەبران، بەڵکو دەبێت دوانەبوونیان وەك حاڵەتێکی ئیجابی سەیر بکرێت، ئێستا جوڵەی خەڵك زۆر بووە، بەهۆی کەمبوونەوەی مەوداکان، بۆ نموونە ئەورووپا کە فیکرەی دەوڵەتی نیشتمانی و برەوپێدان بە فیکرەی رۆژئاوا و ئەوانی تر (the west & otheres) لە زۆر حاڵەتدا خۆی وەك کۆمەڵگەیەکی ئازاد بۆ کولتوورەکان ناوزەد دەکات).[٣٨]

هەندێك لە رۆشنفکران وای دەبینن کە ترسی شوناسی کولتووریی لە مەسەلەی بەجیهانیکردن لە شوێنی خۆیدا نییە، چونکە بەپێی ئەم بۆچوونە ئەوە بە پێچەوانە دەبینرێت، کە دەبێـتە هۆی سەر لە نوێ ژیانەوەی شوناس بۆ ئەوەی لەگەڵ بەجیهانیبووندا بگونجێت، چونکە ئەوەی کە ئێستا دەبینرێت (جەختکردنەوەیە لەسەر گەڕان بە شوێن شوناسێکی دەستەجەمعیی بەهێز و وێنایەکی نوێ بۆ کۆمەڵ لە چوارچێوەی کۆمەڵگە نوێکاندا، نووسەرێکی وەك نافنیسولی (naffesoli) وای دەبینێت کە دینامیکیەتی گۆڕان لە مۆدێرنیزمەوە بۆ پۆست مۆدێرنیزم دەبێتە هۆی گەشەکردنی گۆڕان لە تاکگەراییەوە بۆ کۆمەڵبوون، لە عەقڵانیەتەوە بۆ حاڵەتی سۆزداریی، کە ئەمەش لە حاڵەتی پێش مۆدێرنیزم دەچێت کە حاڵەتێکی تەقلیدییە،

---

[٣٧] أحمد مجدي الحجازي، العولمة وتهميش الثقافة الوطنية، مجلة عـالم الفكـر، العـدد: ٢٨، ٢ أكتـوبر ١٩٩٩، ص١٥٢.

[٣٨] د. حيدر ابراهيم، العولمة وجدل الهوية الثقافية، عالم الفكر، العدد: ٢٨، ٢٠٠٣، ص١٠٤-١١٠.

هەروەها دەڵێت ئەم حاڵەتەی ئێستا جیهان دەگۆڕێتەوە بۆ سەر حاڵەتی خێڵایەتی، کە لە سەدەکانی پێشوودا بەشێوەی تەقلیدی هەبووە، ئەمەش پیێ دەوترێت خێڵایەتی نویێ)[٣٩].

ئەم بۆچوونە جیاوازانە، لە هێزی ئەو ڕایانە کەمدەکەنەوە کە دەیان وت بەجیهانیبوون کاریگەریی ریشەیی دەکاتە سەر شوناسی کولتووریی، واتە بەجیهانیکردن هەرگیز ناتوانێت کولتوورێکی تایبەتی لە بووندا نەهێڵێت ئەگەر هەڵگرانی جوڵاو و مامەڵەیان ئیجابی بێت لەگەڵیدا، واتە بەجیهانیکردن وەك تۆڕێك وایە، هەموو کولتوورێك دەتوانێت بەشداری بکات لە چنین و دروستکردنیدا، واتە چارەنووسی هەر کولتوورێك دەوەستێتە سەر پێکهاتە سایکۆلۆژییەکەی کە ئایا چۆن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی بەجیهانیکردندا مامەڵە دەکات؟

لە داهاتوودا دەبینین کە شوناسەکان شێوە و پێکهاتەیان دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانکارییە نوێیەکان و خۆیان لەگەڵ زەمەنە نوێیەکەدا دەگونجێنن، کە بەشێکی لە کاردانەوە و بەشێکی تر بەهۆی کاریگەرییەوە دەبێت، بەم پێیەش شوناس لەناو ناچێت و گەشە دەکات.

ئێستە لە ئاستێکی جیهانییدا دەبینرێت گەلان هۆشیارییەکیان پێوە دیارە بۆ گرنگیدان بە شوناس و بە پێویستی دەزانن کە بیپارێزن و گەشەی پێبدەن و خۆیان هۆگر بکەن پێوەی، زیندووبوونەوەی ڕابوونی ئاینی لەسەر ئاستێکی جیهانی وەڵامدەرەوەی ئەو پێویستییە نوێیەیە، کە هەر نەتەوەیەك دەیەوێت لە رێگە ئاینییەکەیەوە تەعبیر لە بنیاتنان و پاراستنی شوناس بکاتەوە، ئەم ڕابوونە تەنها تایبەت نییە بە دنیای ئیسلام، بەڵکو لە ناو جولەکەکان و مەسیحییەکان و بوزییەکاندا دەبینرێت، بەپێی بۆچوونی هانتینگتۆن ئاین بنەمای شارستانیەتە، تیۆری ململانێی شارستانییەکان لەبەرامبەر کاردانەوەی ڕابوون و بوژانەوەی ئاینی دانراوە، بەتایبەتی لە جیهانی ئیسلامییدا، کە ئێستا بووەتە بنەمای شوناسی گەلە مسوڵمانەکان، بۆ ئەم

---

[٣٩] هەمان سەرچاوە، ل٥.

مەبەستەش دەبینین لە جیهانی ئیسلامییدا رەوتی میانڕەوی ئیسلامیی دەیەوێت هەڵگری مەشخەڵی شوناس بێت، چونکە ئەم ڕەوتە دەتوانێت لە گۆڕانکارییە جیهانییە نوێیەکان تێبگات و لەگەڵ پێشکەوتن و مۆدێرنیزمدا خۆی بگونجێنێت و شوناسێکی نوێ بۆ گەلانی مسوڵمان بنیات بنێت، ئەو دەیەوێت لە رێگەی پەیڤین و لەیەکترگەیشتنەوە پردێکی پەیوەندیی لەگەڵ گەلان و شارستانیەت و مەدەنیەتی رۆژئاوادا دروست بکات و لە رێگەی کۆڕ و سیمینار و راگەیاندن و رۆژنامە و دامودەزگا ئەکادیمییەکانەوە بارودۆخێکی نوێ بۆ یەکترناسین و لەیەکتر تێگەیشتن دروست بکات، کە بەمەش دیدێکی نوێ بەرامبەر ڕۆژئاوا دروست دەبێت کە هەنگاوێکی ئیجابییە بۆ رۆژئاواناسی و خوێندنەوەی بەرامبەر و دروستبوونی بارودۆخێکی نوێ و یەکتر خوێندنەوە و راگۆڕینەوە و نابێتە هۆی گەشەکردنی دژایەتی و بوغز و ململانێ، لەبەر ئەوە ئەگەر بەجیهانیکردن ببێتە گۆڕەپانی لەیەکترگەیشتن، هەرگیز بارودۆخی شوناس بە ئاراستەی سلبیدا ناچێت بە تایبەتی لەلای گەلانی مسوڵمان کە خاوەن شارستانیەتێك و مێژوویەکی پرشنگدارن لە خوێندنەوەی بەرامبەر و کارکردن لە بازنەیەکی فراوانی مرۆییدا.

(لەمبارەدا بەجیهانیکردن هەرگیز نابێتە دوژمنی شوناس و نابێتە بەدیلێك بۆی، بەجیهانیکردن بەم چەمکە و لەم سنوورەدا لە چوارچێوەی جۆراوجۆری کولتوورەکان و گەشەی شوناسی گەلان و لە بازنەی بوونی گفتوگۆ لە ئاستێکی بەرز لە نێوان ئایین و شارستانیەتەکان، ئەمەش ویستێکی مرۆڤایەتی گەورەیە لە داهاتووی مرۆڤایەتی و ڕوو لە گەشە و کرانەوە دەکات، ئەمەش بە کۆبوونەوەی ئەزموونێکی زۆر دەبێتە مایەی قووڵبوونەوەی رێز و خۆشەویستی بۆ هەموولایەك).

ئەگەر بەجیهانیبوون بە ئاڕاستە مرۆییەکەیدا گەشە بکات، لەپێناو رەخساندنی بوارێك بۆ کولتوور و شارستانییە جیاوازەکان، ئەوکاتە ئەم شارستانیەتەش دەبێتە شارستانیەتێکی جیهانی و لە بازنە مرۆییەکەیدا هەموو گەلان خۆیان بە خاوەنی

دەزانن و هەریەکە لەئاست خۆیەوە پشتیوانی لێدەکات و دەبێتە بوارێك بۆ گەشەکردنی چاکترین و باشترین شوناس کە لە خزمەت مرۆڤایەتیدا بێت.

## شوناس و ڕێگەی سێیەم:

پێویستە لە سەرمان کە لە بواری شوناسدا ڕێگەی سێیەم هەڵبژێرین، واتە لە ڕێگەی مۆدێرنیزمێکی مەدەنی کە بتوانێت شوناس و مەعریفە و ئازادی بەیەکەوە گرێ بدات لە چوارچێوەی سیستمێکی دیموکراسیدا، ئەمەش ڕێخۆشکەرە بۆ پێگەیاندنی تاك بە هۆشیارییەکی مەدەنی کە لەسەر بنەمای کرانەوە و لێبوردەیی و داننان بە بوونی بەرامبەرەکان و جیاوازیی، داڕێژرابێت، هەروەها لەسەر بنەمای هاوولاتیبوون دامەزرابێ، کە سەرچاوەی گرتبێت لە پەروەردەیەکی نوێی پاپەند لەلایەك بە کولتوور و ڕەسەنایەتی، لەلایەکی تریش بڕوای هەبێت بە چەسپاندنی مافەکانی هاوولاتیبوون و بەشداری لە دامودەزگاکانی کۆمەڵگە بەبێ جیاوازی، هەریەکەش بەرپرسیاربێت لە پێشخستن و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە لە بوارە جیاوازەکاندا، شوناسی نوێ دەبێت لەگەڵ پێشکەوتنە جیهانییەکاندا هەماهەنگ بێت و دابڕاونەبێت، دەبێت شوناسی نوێ تاکێکی نوێ بنیات بنێت کە بۆ ئایندە بژی و لە ڕابردووش دابڕاو نەبێت، بەڵکو بەردەوام لەسەر ڕیفۆرمی ڕابردوو کاربکات و لە ئایندەشدا خاوەنی ستراتیژیەتێکی تایبەتی بێت کە تیایدا مەعریفە و زانست و پێشکەوتن ببێتە هۆکارەکانی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە.

دەبێت تاك پشت بە هێزی مەعریفە و قەناعەت پێهێنان و گفتوگۆ ببەستێت لە چارەسەری گرفت و ناکۆکییەکاندا، کراوە بێت و هەوڵی بنیاتنانی دامودەزگا مەدەنییەکان بدات، ئەمەش سەرەتای شۆڕشێکی نوێیە کە دەبێت ببێتە بەرنامە و ستراتیژیەتێکی نەتەوەیی لە پاشان بەشێوەی پلان دابڕێژێت و پلانەکەش ورد بکرێتەوە بۆ پرۆژە و پرۆژەکانیش بۆ چالاکی، ئەم ستراتیژیەتەش دەبێت هەموو دامودەزگاکانی حکومەت لە پەروەردە و فێرکردن و زانکۆ و پەیمانگا و هەموو

ناوەندەکانی خوێندن بگرێتەوە، هەروەها ڕاگەیاندن و بنکەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و ڕۆژنامە و گۆڤار و هۆکارە بینراو و بیستراوەکان.

هەتا لەسەر هەموو ئاستەکان کار لەسەر تاك بکرێت و ئەم هۆشیارییە مەدەنییە تیایدا ببێتە سلوك، واتە تاکێك دروست ببێت کە بتوانێت پێکەوەگونجان لە نێوان نەگۆڕەکانی شوناس و گۆڕاوەکانی دنیای نوێ دروست بکات.

ئەمڕۆ ئێمە پێویستمان بە مرۆڤی وشیار هەیە، کە بتوانێت لە زەمەنی نوێ تێبگات، واتە مرۆڤێکی عاریف بێت بە ئایین و شارستانیەت و کولتوور و مەدەنیەت و پێشکەوتنی نوێ، چونکە مرۆڤ بنەمای هەموو گەشەپێدانێکە، ئەمڕۆ کۆمەڵگەی ئێمەش لە هەموو ئەو قەیرانانەی کە تێیانکەوتووە سەرچاوەکەی لە ڕاستیدا قەیرانێکی مرۆییە، کە خاوەنی گەشەپێدان نییە، چونکە تەنها مرۆڤ دەبێتە سەرچاوەی قەیرانەکان و هەر مرۆڤیشە دەبێتە ڕابەری چاکسازییەکان. ئەمڕۆ لە جیهاندا ململانێی گەورە لەسەر جەوهەری هێزە، جەوهەری هێزیش لە ئێستادا مەعریفەیە.

تەنها نەتەوە کەمتوانا و سنووردارەکانن لە ڕووی عەقڵەوە، پشت بە هێزی سەربازیی دەبەستن و دواجار هەموو هێزەکانی تر لەم پێناوەدا بەفیڕۆ دەدەن و بێجگە لە دواکەوتن هیچ چارەنووسێکی تریان نییە، ئەمڕۆ سوپا و تانك و سەربازەکان نەتەوەکان ناپارێزن، ئەوان نین گوزەرانی باش و پێشکەوتن بنیات دەنێن، بەڵکو جەوهەری هێز و پێشکەوتن و گۆڕان و عەقڵی داهێنەرانەی مرۆڤە کەخۆی دەبینێتەوە لە میکانیکیەتی زانیاری و هۆکانی پەیوەندیی. هەر ئەوەشە ئەمڕۆ کاریگەری لەسەر جیهانی سیاسەت و ئابووری و سەرچاوەکانی بڕیاردان داناوە لە ژینگە گشتییە جیهانییەکەدا.

# بەشی سێیەم:
# شوناسی جیهانیی یان جیهانێك بەبێ شوناس

دکتۆر موحەممەد عابد ئەلجابری دەڵێت:

بەجیهانیکردن، بەڕێوەبردنێکە بۆ هەژموون پەیداکردن، لە هەمان کاتدا سەرکوتکردن و پەراوێزخستنی تایبەتمەندییەکانە، بەڵام جیهانگەرایی ( universals lissome) بریتییە لە حەزی گەشەدان بە تایبەتمەندیەتی بۆ ئاستێك، بەجیهانیکردن دەستگرتنە بەسەر جیهان و جیهانگەراییدا، بەڕووی ئەوەدا دەکرێتەوە کە گەردوونی و جیهانییە.[٤٠]

لە نێو جیهانگەراییدا کۆمەڵێك فەلسەفە و ئەدەب و هونەر و شارستانیەت هەن کە هەر یەکەیان جۆرێك لە تایبەتمەندییان پێوە دیارە، لەم نێوەندەدا هەموو ئەم تایبەتمەندییانە کۆدەبنەوە، پاشان فۆرمێك لەخۆ دەگرن، ئەدەبی بەتایبەتمەندییە نیشتمانی و نەتەوەییەکەی جیا دەکرێتەوە، لەهەمان کاتیشدا دیوە مرۆییەکەی دەبیاتە ئاستێك.[٤١]

لێرەدا جیاوازییەکی گەورە دەبینرێت لە نێوان ئەم دوو دەستەواژەیەدا، جیهانگەرایی واتە هەموو دانیشتوانی ئەم گۆی زەوییە بەهەموو خێڵ و گەل و نەتەوە و زمان و رەگەزەکانی، لەسەر گۆی ئەم زەوییە دەژین، هەر یەکەیان لەگەڵ ئەویترياندا تێکەڵ دەبن لە ڕووی ئاین و زمان و باوەڕ و بۆچوونە سیاسی و ئاینی و سیستمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیانەوە، بوونی جیاوازی لەم چوارچێوەیەدا شتێکی سروشتییە، لەگەڵ ئەم مامەڵەکردن و هاوکارییکردنی یەکتر کارێکی زۆر پێویستە، بۆ ئەوەی ڕێگە بگیرێت لە پێکدادان و جەنگ و دوژمنکاری، ئەم کارە جیهانییەش ناودەبرێت بە (بە رۆشنبیریی بوونی شارستانیەت) لە نێوان گەلان و

---

[٤٠] د. محمد عابد الجابري، العولمة والهوية الثقافية، عشر أطروحات.. ص٣٠١.

[٤١] د. حسين عبدالهادي، العولمة النيولبرالية وخيارات المستقبل، ص٤٨٧.

نەتــەوە جیاوازەکانــدا، ئەمــەش واقیعــی ژیــانی مرۆڤایــەتی بــووە هــەر لــە ســەرەتای مێژووەوە هەتا ئێستا، کە تیایدا زمانەکان لەگەڵ یەکتردا موتوربە بوون و کۆمـەڵگاکان هاوکـاریی یـەکتریان کـردووە و شارسـتانیەتەکانیش گواسـترانەوە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی تر.[٤٢]

ئەگەر سەیری مێژووی مرۆڤایـەتی بکـەین، کۆمـەڵێك شارسـتانیەتی جیـاواز هـەن، لەبەر ئەنجامی کۆمەڵە کولتوورێکی جیاوازەوە دروست بـوون، لـەم ڕوانگەیـەوە ئێـستا جیهان پێویستی بە سیستمێکی کراوە هەیە، بۆ ئەوەی بە یەکسانی و بێلایەنی لەگـەڵ هەموو لایەکدا مامەڵـە بکـات، واتـە فەزایـەکی یەکسان بڕەخـسێنێت بـۆ بەشـداری لـە شارسـتانیەتێکی جیهانییـدا، نـەك لەسـەر بنـەمای داخـران و دوژمنکـاری و ڕێگـرتن و گەمارۆدان.

ئەمڕۆ جیهان پێویستی بە ڕەخساندنی بارودۆخێکی نوێ هەیـە، کـە دان بنێـت بـە تایبەتمەندی و فرەییدا و بگەڕێت بە شـوێن خاڵـە هاوبەشـە مرۆییەکانـدا، بـە تایبـەتی ئەوەی کە لە نێوان کولتوور و شارسـتانیەتییە جیاوازەکانـدا هەیـە، لـەم ڕێگەیەشـەوە فەزایەکی جیهانیی نوێ بنیات بنرێت کە هەموولا تیایدا بەشداربن و ئەمـەش بنەمایـەك بێت بۆ دروستکردنی شوناسێك.

بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە دامودەزگا نێودەوڵەتییەکانی ئەو سیستمە جیهانییە، نوێنەرایەتی تایبەتمەندییە جیاوازەکان و خاڵی هاوبەشـی شارسـتانێتییە جیهانییـەکان بێت.

ئەم پەیوەندییە پێویستە لەسەر بنەمای ڕێسای یەکترناسین بێت لە نێـوان هـەموو گەلاندا، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (الحجرات: ١٣).

[٤٢] د. محسن عبدالحميد، العولمة من المنظور الاسلامي، ص٧.

ئـەم ئایەتـە بـاس لـە دامەزرانـدنی پەیوەنـدیی نێـوان گـەلان و شارسـتانیەتییە جیاوازەکـان دەکـات لەسـەر بنـەمای یەکترناسـین، نـەك ململانـێ و پێکـدادان و ڕەتکردنەوەی بەرامبەر.

لەمبارەیـەوە زەکـی مـیلاد دەڵێـت: لـە ڕوانگـەی ئـەم ئایەتـەوە ئێـستا تیۆرییـەك دروست بووە کە ناسراوە بە (یەکترناسینی شارستانییەتەکان)، چونکە شارسـتانییەتە جیاوازەکان هەتا لە یەکترناسینەوە دەست پێنەکـەن، نـاتوانن لـە پێکدادان و جـەنگ ڕزگاریان ببێت و بگەنە پەیڤین و لەیەکترگەیشتن..

یەکترناسین چەمکێکی مرۆیی مەزنە، هەروەها گرنگی و بەهایـەکی تایبـەتی خـۆی هەیە، یەکێکە لـەو چـەمکانەی کـە ئـەمڕۆ مرۆڤایـەتی زۆر پێویـستی پێیـەتی هـەتا لـە نەهامەتی جەنگ و کوشتار و دژایەتی ڕزگاری ببێـت، پێویـستە گـەلانی جیهـان زۆرتـر گرنگی بەم چەمکە بدەن و لەم ڕێگەیەشەوە شارستانیەت و کولتـووری یـەکتر بناسـن، کە دووربێت لە سەپاندنی هەژموون و داگیرکاری و پەراوێزخستن.

ئێستا کە زەمـەنی بەجیهانیبوونـە، بـە پێـچەوانەی جیهانگەراییـەوە کـار دەکـات، چونکە لە مێژوو و جوگرافیا و کولتوور و شارسـتانیەتییەکانی سـەر زەوییـەوە دەسـت پێ ناکـات، واتـە لـە ئـەنجامی پـەیڤینێکی مرۆییـەوە هەڵنـەقوڵاوە، کـە هـەموو لایـەك بەشـداریی داڕشـتنی بکـەن، بـەڵکو لـە فـەزاوە دەسـت بـە پەخـشبوون دەکـات و لـە ئەنجامی پەیڤینێکی لەوەوپێش نییە، ئەو هەموو جیهانبینی و بۆچوونەکانی لە ڕێگـەی گەردوونەوە پەخش دەکات، پرس بە هیچ نەتەوە و نیشتمانێك ناکات.

ئاینەکان و مەزهەبە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان ڕەهەندێکی جیهانییـان هەیـە، بـەڵام دابـڕاو نـین لـە تایبەتمەنـدیش، کەواتـە لـەم ڕووەوە دەتـوانین بڵـێین لـە مێژوودا فەلسەفە جیاوازەکان زۆرتر مرۆیی بوون.

لــە دوای پێــشکەوتنی شۆڕشــی زانیــاری و تەکنــەلۆژی و فراوانبــوونی شۆڕشــی پەیوەندییەکان بە شێوەیەك کە هەموو ئاستەکانی گرتووەتەوە.

لێرەشـەوە هـەر چـەند بانگەشـەی ئایـدۆلۆژیا دەکرێـت، بـەڵام لـە فـۆرمێکی تـردا ئایـدۆلۆژیا دێتــە نـاو تەکنــەلۆژیا، بەشـێوەیەك فـروانتر دەیبیـنین، جـۆرێکی تـر لـە جیهــانبینی بەتایبــەت لــە بــواری زانــستە مرۆییــەکان و کۆمەڵناســی، کــە زیــاتر ڕەنگدانەوەی فەزای جوگرافیایەکی تایبەتییە، لێرەوە ئـەو جیهانبینییـە نوێیـە دێـت و خۆی بە جیهانیی دەزانێت، ئێستا تێکـەڵکردنێك لـە نێـوان کولتـوور و شارسـتانیەتیدا هەیە، ئەم شارستانیەتییەش بە ڕۆژئاوایی ناسراوە و بە بەرهەمی کولتووری ڕۆژئاوا لـە قەڵەم دەدرێت و لەسەر هەموو گـەلانی جیهـانیش پێویـستە کـە قبـوڵی بکـەن. لەگـەڵ پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی شـێواز و گۆڕانکـاریی نـوێ هەیـە، کـە دەیـەوێت ناسنامەی زۆربەی شتەکان بگۆڕێت.

بـە بۆچـوونی سـەید یاسـین (لەگـەڵ گەشـەکردنی شۆڕشـی زانیـاریی، پەیوەنـدیی گەردوونی، گۆڕانێکی جەوهەری لـە بـواری داڕشـتنەوەی شوناسـدا ڕوودەدات، چـونکە لەم زەمەنی ئینتەرنێتـەدا تـاك خـۆی دەتوانێـت چـاودێریی گەشـە و بەرهـەمی عـەقڵی مرۆڤایەتی بکات و لەم ڕوانگەیەوە ڕووە گەشەکانی ڕۆحـی مرۆڤـی نـوێ ببینێـت، لـەم ڕێگەیەشەوە تاك دەتوانێت شوناسی تایبـەت بـە خـۆی دروسـت بکـات، بـەبێ ئـەوەی ملکەچی کاریگەرییەکانی پیاوە ئاینییە تەقلیدییەکان بێت، یان بکەوێتە ژێر کاریگەریی دەزگا ڕاگەیاندنـە جەماوەرییـەکان. بـە واتایـەکی تـر، سـنوورەکانی ئـازادیی مـرۆڤ تـا ڕاددەی بـێ سـنوور زیـاد دەکـات، هـەروەها هۆکـانی داهێنـان دەچـنە ئاسـتێکی بـێ سنوور.[٤٣]

بەهۆی پێشکەوتنی هۆکانی پەیوەندییەوە، ئاسۆکانی مرۆڤی مۆدێرن فراوان بـوون و دەتوانێت لە جۆرەها ڕێگەوە بەبێ سانسۆر زانیـاری وەربگـرێ و ئاگـاداری گەشـەی کولتووری نەتەوە جیاوازەکان بێت.

لەم ڕێگەیەشەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی جۆرەهـا دیـد و جیهـانبینی و شـێوازی ژیانی نوێی گەلان.

---

[٤٣] السيد الياسين، العالمية والعولمة، دار مصر للطباعة والنشر، ٢٠٠٠م، ص٩٣.

ئینتەرنێتیش ئێستا هۆکارێکی بنەڕەتییە بۆ پەیوەندیی مرۆیی، ئەویش لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕاستەوخۆی جۆرەها سەرچاوەی فیکریی جۆراوجۆر، هەروەها لە ڕێگەی پەیوەندیی ڕاستەوخۆوە کە بەهۆی نامەی ئەلیکترۆنییەوە ئەنجام دەدرێت، لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانێت بەشداریی مشتومڕی جۆرەها گرووپ بکات کە لەسەر بنەمایەکی دیموکراسی دروست بووە، کە ڕێگە دەدات ڕا و ڕای بەرامبەر هەبێت و هەر کەسە بە ئازادی تەعبیر لە ڕای خۆی بکات.(٤٤)

لەو ڕوانگەیەوە کە ئێستا جیهان وەك گوندێکی لێهاتووە بەپێی بۆچوونی زۆر لە ڕۆشنبیرانی جیهان، ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی کە هەموو کولتوورەکان و شارستانیەتە جیاوازەکان یەکتر بناسن، بە تایبەتیش لەسەر ئاستی ئازادییەکانی تاکە کەس، کە لەم ڕێگەیەشەوە تاك شوناسی خۆی هەڵدەبژێرێت و شوناسەکانی تریش دەناسێت.

بەڵام ئەمەش بەپێی ئاستی هوشیاری و تێگەیشتنی تاك دەگۆڕێت، لەگەڵ ئاستی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژی، چونکە تاك کاتێك شانازی بە شوناسی خۆیەوە دەکات کە بۆشاییە ماددی و مەعنەوییەکانی بۆ پڕ بکاتەوە، واتە کاریگەری لەسەر باشکردنی گوزەرانی تاك هەبێت، لەهەمان کاتدا لە ئاست مێژوو و ئاین و شارستانییەتی نەتەوەی خۆی جۆرێك لە زانیاری هەبێت کە ئیرادەیەکی مرۆڤدۆستانەی بۆ دروست بکات.

بەپێی بۆچوونی سەید یاسین (تواناکانی تاك بۆ هەڵبژاردنی تێڕوانینی نوێ بۆ جیهان زیاد دەکات، ئەویش لە ڕێگەی ئاشنابوونی فیکری بەرامبەرەکانەوە دەبێت، کە ئەوەش دەبێتە هەرسکردنی شێواز و وێنە چەقبەستووەکان کە لەنێو کولتووری زۆربەی گەلاندا هەیە، لێرەوە سەرەتایەکی نوێ بۆ پەیڤینێکی شارستانی سەر هەڵدەدات کە دەبێتە هۆی کۆتایی هاتن بە دەسەڵاتە خۆسەپێنەرە تاکڕەوەکان کە بەردەوام هەوڵیان داوە بۆ لەقاڵبدانی عەقڵ و ویژانی خەڵك، لە ڕێگای سەرکوتکردن و

[٤٤] هەمان سەرچاوە، ل٩٤.

داگیرکاریی شاراوە بۆ سەر عەقڵی هاووڵاتیان کە لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا پیادەی دەکات بە ئایدۆلۆژییەتێکی تایبەت. یاسین لەو بڕوایەدایە کە ئەم پەیڤینە گەردوونییە دەبێتە هۆی بنیاتنانی هەستێکی مرۆیی نوێ کە لەسەر بنەمای ئازادی و لێبوردەیی و تێگەیشتنی بەرامبەر دامەزرابێت، ئەم شنەبایەش دەبێتە هۆی ڕامالینی هەموو بۆچوونێکی توندڕەوانەی نەتەوەیی و ئایینی).[٤٥]

لەو سیستمە جیهانییەی کە لە دوای شەڕی سارد بنیاتنرا، راستەوخۆ هەستمان بە گەشەکردنی ئەم دید و بۆوچونە کرد، ئەمەش لە ڕووی تیۆرییەوە لەسەر دەستی (فۆکۆیاما) بنیات نرا لە کتێبی (کۆتایی مێژوودا) (کە باس لە لیبڕالیزمی ڕۆژئاوایی دەکات وەك سیستمێك بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە هەموو تاکڕەوی و ناخۆشییەك و بنیاتنانی جیهانێکی نوێ کە تیایدا تاکەکان هەست بە ئازادی و خۆشگوزەرانی دەکەن).

فۆکۆیاما لەم ڕێگەیەشەوە پێشنیاری شوناسێکی کرد کە بە بڕوای ئەو توانای زاڵبوونی هەیە بەسەر هەموو تایبەتمەندییە کولتوورییەکان، فۆکۆیاما کولتووری ڕۆژئاوایی بە تەنها کولتوورێك دەزانێت کە ببێتە کولتووری و لەم ڕێگەیەشەوە شوناسێکی بنیات بنێت.

لە گوندی گەردوونیدا سەرکردەکانی بەجیهانیبوون پێویستە مەشخەڵی ڕێگەیەك بگرن بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی ئەم گوندە گەردوونییە بکەن کە هەموو نەتەوە و گەلانی سەرگۆی زەوی لەخۆبگرێت و لە چوارچێوەی سیستمێکی هاوبەشدا کۆببنەوە کە خاوەنی ئەخلاقێکی مەدەنیی بێت و سەرکردایەتییەکی رووناکبیری هەبێت کە ڕێبەرایەتی گەلان بکات بۆ بەئەنجام گەیاندنی گفتوگۆیەکی نێودەوڵەتیی یەکگرتوو.[٤٦]

---

٤٥ هەمان سەرچاوە، ل٩٤.

٤٦ أحمد مجدى الحجازي، العولمة وتهميش الثقافة الوطنية، ص١٢٦.

کاریگەرییەکانی بەجیهانیبوون لەسەر شوناس بە دوو ئاڕاستەیە، لەلایەك بووەتە مایەی دڵەڕاوکێ و ترس، لەلایەکی تریش مایەی گەشبینییە.

ئەگەر سەیری زۆربەی فەیلەسوفانی مێژوویی بکەین، هەر لە (ئۆمنت و جۆن ستیوارت) هەتا (کارل مارکس و ئەنتۆنی گیدنز)، بە گەشبینییەوە سەیری ئایندەی مرۆڤایەتییان کردووە و لەو بڕوایەدا بوون کە سەرئەنجام بەسەر هەموو سنوورە نەتەوەییەکاندا باز دەدەن و دواجار بەرەو کولتوورێك هەنگاو دەنێت، لەم ڕوانگەیەشەوە دەتوانین بەجیهانیبوونی بازاڕ و دەسەڵات و هۆکارەکانی پەیوەندی ببینین، کە ئەمەش لە خزمەت بەهێزبوونی تێڕوانینە جیهانییەکاندایە، لێرەشەوە سنوورەکان فراوان دەبن، کە ئەمەش دەبێتە مایەی زیادبوونی هۆشیاریی تاك بە سوودەکانی هاوکاریی نەتەوەکان لە ڕێگەی دەزگا لۆکاڵییەکان و دامودەزگا جیهانییەکان.(٤٧)

زۆر لە تیۆریسانی بواری بەجیهانیکردن مژدەی ئەوەیان دەدا، کە لە زەمەنی بەجیهانیکردندا لەبەر ئەوەی کۆتایی بە ڕژێمە تاکڕەوەکان دێت و دیموکراسی باڵ بەسەر جیهاندا دەکێشێت، کەواتە قۆناغێکی نوێی ژیانی مرۆڤایەتی دەبێت لە ئارامی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی، چونکە بەشێکی زۆر لە لێکۆڵەرەوانی بواری سیاسی وایان لە قەڵەم دەدا کە کۆتاییهاتنی جەنگی سارد دەستپێکردنی زەمەنێکی نوێیە لە ژیانی مرۆڤایەتی و مانای کۆتایی نەهامەتییەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت، هەروەك فۆکۆیاما لە کتێبی کۆتایی مێژوودا باسی دەکرد، لەم ڕوانگەیەوە پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ دەبێتە سیمایەکی ئەم جیهانە نوێیە و لە ڕێگەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانیشەوە ئەم بارودۆخە زۆرتر لە ئارامی و چەسپاندنی دیموکراسی دەکات.

ئەگەر ئەمە ڕاست بوایە ئەوا بەجیهانیکردن یان بە گەردوونیبوون (globalization) ئەو پرۆسەیە دەبوو بەوەی بەربەست و سنووری نێوان دەوڵەتان

---

[٤٧] بیانوریس، حکم عالمي ومواطنون عالميون، ص٢٢٢.

و گــەلان هەڵدەگیرایــە و گــەلان لــە حاڵــەتی دابــڕان و پەرتــەوازەیی دەچــوونە دۆخــی یەکبوون و یەکگرتن، لە حاڵەتی ململانێوە بۆ حاڵــەتی ڕێکــەوتن، حاڵــەتی هۆشــیاری و بنــەمای بەهایــەکی یــەکگرتوو دروســت دەبــوو لەســەر بنــەمای ڕێکــەوتنێکی مرۆیــی گشتی[٤٨].

ئەگــەر بــەجیهانیکردن بــەو ئاڕاســتەیەدا هــەنگاوی هەڵبگرتایــە کــە بڵاوکردنــەوەی بەهاکانی دیموکراسی و لێبوردەیی و مافەکانی مرۆڤ و هۆشیاریی مەدەنییە لــە ڕێگــەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، ئەوا ئەمە دەبــووە هــەنگاوێکی گــەورە لــەپێناو دروستکردنی کولتوورێکی جیهانیی بەتایبەتیش لەسەر ئاستی سیاسی.

کێشەی ئافرەت و کەمــە نەتــەوەکان و ســەروەریی یاسا و کولتــوور و کــارگێڕیی، یەکێکن لە پێکهاتە گرنگەکانی کولتووری هەریــەك لــە گــەلانی جیهــان بەتایبــەتیش لــە ڕێگەی بەشدارییان لە نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخــراوە تایبەتییەکانیــدا، بــۆ نموونــە وەك بەشدارییان لە کۆنگرەکانی (کۆنگرەی باڵای گەشەپێدانی زەوی).

هەروەها ئەمڕۆ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە لە هەموو سووچێکی جیهاندا بڵاوبوونەتــەوە و ڕۆڵیــان هەیــە لــە گرنگیــدان و بڵاوکردنــەوەی ئــەو چــەمکانەدا، بەتایبەتیش لەو جێگایانەدا کە جاران دابڕاو و پــەراوێزخرابوون، بــەڵام ئــەمڕۆ دەبینــین کە بەشێکن لە گوندی گەردوونی، یان پشت دەبەستن بەوەی ئەمڕۆ کە پێــی دەوترێــت (دیموکراسیەتی ئەلیکترۆنی) کە پشت بە ئینتــەرنێت دەبەستێت، دەتوانرێــت ئەمــەش بــەکاربهێنرێت بــۆ لــەخۆگرتنی ژمارەیــەکی زۆر لــەو جــەماوەرەی کــە ڕۆڵیــان هەیــە لــە دروستکردنی بڕیارە ئاڵۆزەکان[٤٩].

بــەجیهانیبوون کۆمــەڵێك زانیــاری و فیکــری نــوێ بەرهــەم دەهێنێــت بــە هــەموو جیهاندا پەخشی دەکات بەشێوەیەك کە لەوەوپێش لە ئارادا نەبووە، گواستنەوەی ئەم زانیارییانە جۆرێك لە هۆشیاریی نوێ بەرهەم دەهێنێت، بەرهــەمهێنان و بڵاوکردنــەوەی

[٤٨] أحمد مجدي الحجازي، العولمة وتهميش الثقافة الوطنية، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

[٤٩] د. حيدر ابراهيم، العولمة وجدل الهوية الثقافية، مصدر سابق، ص١١٩.

بەردەوامی ئـەم زانیارییانـە جۆرێـك لـە یـەكبوون لـە نێـوان خەڵكدا دروسـت دەكـات، بەتایبەتی لە ئاستێكی جیهاندا (بەئەمریكاییكردن)، كـە ئەمـەش بـواری خۆشـییەكانی مرۆڤ و گرنگییەكانی ژیانی دەگرێتەوە.

هەمبەرگر لە ماكدۆناڵدا ئێستا لە هەموو شوێنێك هەیە، لە پەكین و بۆینس ئـایرس و زۆر شـوێنی تـر، هـەناردەكانی مۆسـیقا و زمـان بـۆ سـەر كولتوورەكـانی پـاریس و سەنگافورە، لە هەمان كاتدا دەبینین كە هێرشی فیكـر و بـەها دەرەكییـەكان بوونەتـە مایـەی دروسـتكردنی بەرگرییـەكی بـەهێز لـە بـەها و شـێوازە تەقلیدییـەكانی ژیـان، لەلایەكی ترەوە ڕێكخـراوە ناحكومییـەكان هاوكـاربوون لـە دروسـتكردنی تێڕوانینێكـی گـەردوونی و جیهانیـدا، لەهـەمان كاتـدا دەتـوانن بـەرگری لـە بـەها و كێـشەكانی ئـەو هاوولاتیانـە بكـەن كـە لەبەرامبـەر تێڕوانینـە جیهانییەكـەدا نامۆبوونیـان بـۆ دروسـت بووە[٥٠].

ڕێكخـراوە ناحكومییــە جیهانییــەكان و تــۆڕی ڕێكخراوەكـانی، توانــای خۆیــان سەلماندووە لەوەی كە توانایەكی زۆریان هەیە لەسەر جوڵاندنی خەڵك و سەرچاوەكانی كار لە جیهاندا لە كۆمەڵێك گرفتی گشتی و گرنگـدا، واتـە توانیویانـە ڕۆڵـی بەرچـاویان هەبێت لە پشتیوانیكردن لە كۆمەڵێك كێشەی مرۆیی و توانیویانە لە ئاستێكی جیهانیدا تەعبیری لێ بكەن، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بە كار و پاراستنی مافی كرێكـاران و باشكردنی گـوزەران و زۆرجـاریش داكـۆكیكردن لـە مـافی گـەلان و وەسـتانەوە دژ بـە تاكڕەوی و دیكتاتۆریەتی هەنـدێك لـە ڕژێمـەكان هەیـە، لـەم ڕووەوە ڕۆڵـی بەرچـاویان هــەبووە لــە دروســتكردنی فــشاری جۆربــەجۆر بــۆ چارەســەركردنی گرفتــەكان، یــا خۆپیشاندان لە بەرامبەر كۆنگرە جیهانییە گەورەكانی وەك هەشت وڵاتـە پیـشەسازییە گەورەكەی جیهان، یان ئەو فشارە گەورەی كردیان لە ئاستێكی جیهانیدا بۆ ڕێگرتن لە

[٥٠] رافيد براون، العولمة والمنظمات غير الحكومية وعلاقات القطاعات المتعددة، بحث في كتـاب الحكـم في عـالم يتجه نحو العولمة، ص٣٧٦.

لـوغمی ژێـر زەوی لەکاتێکـدا کـە زۆر لـە حکومەتـە نەتەوەییـەکان داوای مانـەوەیان دەکرد.

ئـەو گرووپانـەی کۆمەڵگـەی مـەدەنی کـە رۆیـشتن بـۆ سـیاتێڵ و خۆپیـشاندانی گەورەیان کرد، بوونە هۆی ئەوەی کە بازنەی گفتوگۆکانی رێکخراوی بازرگـانیی فـراوان بکەن و لەم پێناوەشدا رێکخراوەکان فشاری زۆریان کـرد کـە گرنگـی زیـاتر بـدرێت بـە مافی کرێکاران و پاراستنی ژینگە.

لەلایەکی ترەوە بە هۆکاری رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەتوانرێت کۆمەڵێك بــەها و پرانــسیپی مرۆیــی گــرنگ دابڕێــژرێت بــۆ بنیاتنــانی کولتــوورێکی جیهــانیی هاوبەش.[٥١]

بـەڵام ئەگـەر سـەیری واقیعـی ژیـانی تـاك بکـەین لـە کۆمەڵگـە ناڕۆژئاواییەکانـدا، دیموکراسـیەت و مافـەکانی مـرۆڤ و مافـەکانی ئـافرەت وەك بەهایـەکی مرۆیـی سـەیر دەکـرێن، ئەمانـەش لەڕاسـتیدا بەرهـەمی خـەباتێکی درێـژی گەلـە جۆربـەجۆرەکان و شارستانیەتییە جیاوازەکان بووە، بە پێچەوانەی هەندێك بۆچوونەوە کەوا دەزانـن ئـەم بەها مرۆییانە بەرهـەمی کولتـووری ڕەگـەزێکی تایبـەتین، وەك هەنـدێك لـە ڕۆشـنبیران باسی دەکەن.

ئەگـەر سـەیر بکـەین ئـەمڕۆ ژمارەیـەکی زۆر لـە حیـزب و نەتـەوە و بزووتنـەوە و رۆشنبیر و کەسایەتی جیاواز هەیە کە بڕوایان بە مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی ئـافرەت و کۆمەڵگەی مەدەنی و گەشەپێدانی ئابووری و مـۆدێرنیزەکردنی کۆمـەڵگاکانیان هەیـە، بەڵام مەرجەعەیەتیان لیبراڵیەتی رۆژئاواش نییە، لەبەر ئەوە ئـەمڕۆ ئێمـە جـۆرێکی تـر لە چاکسازی دەبینین، کە ئەویش کارکردنـە لـەپێناو جێبـەجێکردنی ئـەم چـەمکانەدا، بەڵام مەرجەعیەتێکی کولتووریی تایبەت نەك رۆژئاوایی، هەندێك لە بیرمەندانی رۆژئـاوا هەستیان بە ئەم ڕاستیە کردووەو لەمەش ڕازی نین، چونکە ئەوان پێیـان خـۆش نییـە

[٥١] هەمان سەرچاوە، ل٣٩٠.

کولتووری رۆژئاوا ببێتــه چوارچـێوەیەك بـۆ شوناسـی گـەلانی تـر، بـەڵام لـە دەرەوەی جیهانبینی رۆژئاواییدا.

ئێستا ئەم دیدە نوێیە بۆ دیموکراسی و کۆمەڵگـەی مـەدەنی لـە گەشەسـەندندایە، لەبـەر ئــەوە دەبیـنین زۆربــەی گەلــە رۆژئاواییــەکان دەیانــەوێت لەبەرامبــەر ئــەویتری رۆژئاوایی خاوەنی شوناسی خۆیان بـن و رێگـە نـەدەن کـە بـە ئاسـانی رۆژئـاواییبوون هەژموونی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت.

ئەم دیاردەیە بەتایبەتی ئێستا لەناو گەلە ڕۆژهەڵاتییەکاندا دەبینرێت، یابانییەکان بە پێشڕەوی ئەم بۆچوونە نوێیە دادەنرێـن، کە دەیانەوێت شوناسی یابـانیبوون بکـەن بە بەری بەرهەمی تەکنەلۆژی و بۆچوونە ڕۆژئاواییـەکان لەمـەڕ زۆر دیـاردەی ژیـان لـە ڕووی ئـابووری و سیاسـی و کۆمەڵایەتییـەوە، پاشـان بـە وێنەیـەکی تـر لـە شوناسـی یابانیبوون وێنەی دەکێـشنەوە و دەیکەنـە بـەرگێکی نـوێ بـۆ کۆمەڵگـەی یابـانی وەك (هــاتینتگتۆن) وتــی شــوناس لــەم ســەدە نوێیــەدا ڕۆڵــی گــرنگ پەیـدا دەکاتــەوە و شارســتانیەت و ئــاینیش ڕۆڵــی گــرنگ دەبیــنن لــە دارشــتنەوەی شوناســدا، نەتــەوە مــسوڵمانەکانیش ئێــستا لــە هەنگاونانــدان بــەرەو بنیاتنــانی ئــەو شوناســە، کۆمــەڵێك بیرمەندی نوێ و بزاڤی نوێ دروست بـوون کـە جـەخت لەسـەر پێکهاتـەکانی شوناسـی کۆمــەڵگاکانیان دەکەنــەوە لــە نەتــەوە و ئــاین و شارســتانیەت، بەمــەش دەیانــەوێت وێنەیەکی نوێ بدەن بە شوناسی کۆمەڵگە، ئەو بزاڤە سیاسییانەش کە بەم ئاڕاسـتەیە بیردەکەنەوە لـە گەشـە و بەرەوپێشـچووندان، بـەڵام ئـەو بزاڤانـەی کـە لـە بازنەیـەکی دیاریکراودا دەخولێنەوە و توانای بەرهەمهێنانی فیکری تازە و نوێبوونەوەیان نییە، بە هەردوو بـاڵی ئیـسلامیی و عەلمانییـەوە لـە پاشەکشە و پەراوێزبوونـدان، لەبـەر ئـەوە چاکــسازی لـــە فیکــری سیاســی و دەســـەڵات و حیزبـــە سیاســییەکانی ئیــسلامیدا پێویستییەکی هەنووکەییـە و پێویـستە بـە ئاڕاسـتەیەکی نـوێ دیـد و تێڕوانینـەکانیان دابڕێژنەوە و لە بازنەی شوناسێکی نوێدا کاربکەن، کـە ئایـدۆلۆژیابوون تـێ بپـەڕێنێ و بگاتە بازنەیەکی فراوانتر لە خوێندنەوەیەکی مرۆییانە بۆ چەمکەکانی ژیـان. لەکاتێکدا

که مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ بەجیهانیبووندا دەکات واتە لە فەزایەکی نوێدا کار دەکات، بەتایبەتی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە هەموو شتەکان بەرەو بەبازاڕیبوون دەچێت و دەیانەوێت کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەرەو کۆمەڵگەیەکی بەکاربەر بەرن، واتە جیهان دابەش بکرێت بەسەر دوو ئاستی تایبەتی، ئاستی بەکاربەرەکان کە کۆمەڵگاکانی باشوورن، بەرهەمهێنەرەکان کە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانن.

هەندێك لە تیۆریسانی وەك ئۆمای لەوباوەڕەدان کە ئەم سەردەمە (کۆتایی قۆناغی سەردەمی دەوڵەتی نەتەوەییە)، ئەم سەدە نوێیە چاخێکی مێژوویی نوێیە کە هێزێکی بازاڕیی هەژموونی تیادا پەیدا دەکات، کە سەر بە ڕۆژئاوایە و نەیارەکانیان لە حکومەتەکان و ئابوورییە نەتەوەییەکان هیچ توانا و دەسەڵاتێکیان لە بەرامبەریاندا نییە.[52]

دکتۆر موحەممەد عابد ئەلجابری دەڵێت: (بەجیهانیبوون، جیهانێکە بەبێ دەوڵەت، بەبێ نەتەوە، بریتییە لە دەزگا و تۆڕەکان، (بکەرەکان) کە خاوەن بڕیارن و (کارتێکەرن) لەگەڵ بەکارهێنەرانی خواردن و خواردنەوە و لە قوتونراو و وێنە و (زانیاری) و بزووتن و دانیشتن... کەبەسەریاندا دەسەپێنرێت. نیشتیمانیان (گەردوونی سیبرنیتی)یە کە تۆڕەکانی پەیوەندی بۆیان دیاری دەکات و (ئابووری و سیاسەت و کولتوور) لەخۆدەگرێت[53].

لەبەرئەوە، ئەگەر بەپلانێکی ستراتیژییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا نەکرێت، ئەوا تاکێکی بێبەرنامە دروست دەبێت، کە هەریەکە بە بیانوویەك دەگەڕێتەوە بۆ بازنە بچووکەکانی ئینتیما، یان بەرهەمهێنانی گرووپی توندڕەو و دروستبوونی مەزهەبێکی توند و داخراو و پەراوێز لە گۆڕانەکانی جیهان، ئەگەر سەرنج بدەین ئەمە بە ئاشکرا دەبینین، کە زۆرجار گەڕانەوە بۆ خێڵ و گرووپی نەتەوەیی توندڕەو و سەرهەڵدانی

[52] بیانوریس، حکم عالمي ومواطنون عالميون، بحث في كتاب الحكم في عالم يتجه نحو العولمة، مصدر سابق، ص٢٢٢.

[53] محمد عابد الجابری، قضايا فی الفكر العربي المعاصر، مصدر سابق، ص٤٨.

گرووپــی تونــدڕەوی جۆربــەجۆر، وەڵامدانەوەیــەکی بێبەرنامــە و تێنەگەیــشتنە لــە ئامانجەکانی ئەو فەزا نوێیە جیهانییەی کە دروست بووە.

شڵەژانی ئەم کۆمەڵگایانە، لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەمان خاوەنی بەرنامە و تەکنەلۆژیا و هۆکاری ئەوتۆ نین هەتا لە ئامانجی جیهانە نوێیەکە تێبگەن، دواکەوتوویی و نەبوونی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و لاوازیی دیموکراسی و تاکڕەویی سیاسی، وای کردووە کە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە هەتا ئێستاش لە بازنەیەکی زۆر بچووکدا بژین، کە تەنها بیرکردنەوە بێت لە دابینکردنی مافە سەرەتاییەکانی تاک، هەتا ئێستاش بێبەشە لێی، لە بەرامبەریشدا ڕۆژئاواییەکان بەتایبەتی ئەمریکییەکان، بە کۆمەڵێك دەزگا و هۆکاری نوێوە دادەبەزنە گۆڕەپانی ململانێوە، بە کۆمەڵێك بەهاو نوێوە، کە تەعبیر لە بۆچوونە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی دەکات، لە بەرامبەریشدا هیچ هۆکارێکی تەعبیرکردن لە خود و شوناس نابینین، لەبەرئەوە دواجار، هێزەکانی بوون وەك بەشێك لە داگیرکاری راڤە دەکەن.

ئەگەر نەتەوەیەك بەبێ پلان و ستراتیژیەت بچێتە ناو کایەی بەجیهانیبوون، ئەوا تووشی جۆرێك لە هەڵوەشان و پەرتەوازەیی دەبێت و ناتوانێت مامەڵە لەگەڵ دەستەواژەی شوناسی بکات، چونکە دواجار ئەو شوناسە دەیەوێت تۆ بکات بە بەشێك لە خۆی، نەك تۆ تاکێکی بەشداربیت بەتایبەتمەندی خۆتەوە لە دارشتنی ئەو شوناسەدا.

شوناسی جیهانیی، شوناسێکی ئەبستراکت و دابڕاو نییە لە ئایدۆلۆژیا و کولتوور و شارستانیەت و مێژووی ئەوی تر، بەڵکو ئەویش لە ژێر کاریگەریی ئەو کۆمەڵگەیەدایـە، کە لێیەوە سەچاوە دەگرێت، بیرمەندە ئەکادیمی و سیاسییەکانی هـەر وڵاتێـك نـەوەی ژینگەکانی خۆیانن، لەبەرئەوە ئەو ژینگەیـە لەسـەر پـەروەردەی عـەقڵی و دەروونـی و ئەخلاقیات هەیـە ئـەو شوناسـە جیهانییـەش کـە زۆرتـر لـە ژێـر کاریگـەریی پێکهاتـە و ئاســتی فیکــری و ڕۆشــنبیری و تەکنــەلۆژیی کۆمەڵگــەی ئەمریکادایــە، کــە ئــەم کۆمەڵگەیەش کۆمەڵگەیـەکی بـێ مێـژوو و شارسـتانیەت و نەتەوەیـە، ئەمـەش بـەمانا

مێژوویی و ئایدۆلۆژییەکەی ڕاستە، لەبەرئەوە دەبینین هەموو دەستەواژەکانی کۆتـایی ئایـدۆلۆژیا و کۆتـایی مێـژوو پۆسـتی هـەموو دیاردەکـان سەرچـاوەی سـەرەکییان ئەمریکایە، لەبەر ئـەوە تـۆ دەبێت بزانیـت پێکهاتـەی ئـەم دوو کۆمەڵگەیـە جیـاوازن، چونکە لە دەرەوەی ئەمریکا کولتوور و شارستانیەت و مێـژوو شـوناس و ئـاین هەیـە، لەبەرئـەوە دەبێـت هـەڵگری شوناسـەکان لـە دەرەوەی ئـەوان، جـۆرێکی تـر بێـت و ڕەنگێکی تری هەبێت.

چونکە کاتێك کە تۆ وا دەزانی هـەڵگری شوناسـێکی، بـەڵام بـێ ئـەوەی بـە خـۆت بزانیت تۆ چوویتە ناو بازنـەی شوناسـێکی تـر، کـە بـەردەوام ئـەو بـە چـاوێکی کـەمتر سەیرت دەکات و تۆش دەکاتە بەشێك لە داینەمۆی بەگەڕخستنی ویستەکانی خـۆی و دەچیتە خزمەت ئەویتر لە ڕووی تەکنەلۆژی و شارستانی و ئاینییەوە.

لـە کتێبـی (سـەرکەوتنی بێمانـا)دا فەیلەسـوفی فەرەنـسی (کـورنلیس کوسـتر یادسیس) تێبینی ئەوە دەکات کە ئەم جیهانەی ئێمە تێیدا دەژین، دیاردەیەکی نوێ و سەیر و سەمەرەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەویش بریتییە لە هەڵوەشانی مەرجـەعیات و سەرچاوەکانی مانا و مەبەستەکان.[٥٤]

دروستبوونی ئەو شوناسە جیهانییە بەو مانایەی کە باسمان کرد کـە تـاك دادەبڕێـت لـە هـەموو باکگراونـدێکی ئـاینی و کولتـووری و نەتـەوەیی و مێـژوویی و شارسـتانی، مرۆڤێکـی بێبـاك و کەمتەرخـەم و پـەراوێز لـە ژیانـدا دروسـت دەکـات، خـۆی ناکاتـە خاوەنی کێشەکانی نەتەوەکەی، بەڵکو تاکێکی پراگماتی لێ دروست دەبێت و تەنها بـە شوێن قازانج و خۆشی و باشیی گوزەراندا دەگەڕێت. لە ڕاستیدا ئەوەی کە ئێستا پێـی دەڵێن شوناسی جیهانیی، بوونی نییە، بەڵکو ناوێکە پێچراوەتە ئایدۆلۆژیای ڕۆژئاوا کە مەرجەعیەتی لیبراڵیزم و شارستانیەت و مێژوو و ئاینی ڕۆژئاوایە بە کۆمەڵێك ریفـۆرمی نوێوە، کە ئامانجی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی جیهانییە وەك ئەوەی کـە پێـی دەڵـێن کۆمەڵگەی بازاڕی گەردوونی.

---

[٥٤] د. السيد ولد اباه، اتجاهات العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

بەجیهانیبوون شێوازێکی نوێیە بۆ بەرەوڕووبوونەوەی شارستانیەتییەکانی تر بە جۆرەها هۆکار، چونکە ڕۆژئاوا بڕوای بە فرەکولتووری نییە و ڕێز لە بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی و سروشتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان ناگرێت، بەڵکو دەیەوێت هەژموونی خۆی بەسەر هەموو کولتوور و شوناسەکاندا بسەپێنێت بە ناوی کولتووری یان شوناسی جیهانییەوە، ئەمەش بە ئاشکرا لە خستنەڕووی تیۆری ململانێی شارستانیەتەکاندا دەبینرێت کە هانتینگتۆن پێشنیاری کردووە، واتە ململانێ لە جیاتی گفتوگۆ و هەژموون لە جیاتی پێکەوەژیان، ئەو ترسەی کە هانتینگتۆن باسی دەکات لە شارستانیەتییەکانی تر، بە تایبەتیش دژی شارستانیەتی ئیسلامیی، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئێستا بزاڤێکی جەماوەری جیهانی لە ئیسلامیدا لە سەرهەڵداندایە کە دەگەڕێت بە شوێن شوناس و کولتووری ئیسلامیدا و ڕازی نابێت بەو هەژموونەی کە ئێستا ڕۆژئاوا دەیەوێت لە ڕۆژهەڵاتدا بیسەپێنێت.

هانتینگتۆن لە وتەیەکیدا دەڵێت: (وڵاتانی ناڕۆژئاوایی ناتوانن بچنە نێو تۆڕی چنراوی ڕۆژئاواوە هەر چەند ئەوانە کەلوپەلی ڕۆژئاوایی بەکاربهێنن و لاسایی ئەخلاقی ئەمریکی بکەنەوە و گوێ لە مۆسیقای ڕۆژئاوایی بگرن، گیانی هەموو شارستانیەتێك بریتییە لە زمان و ئاین و کولتوور وترادسیۆن، شارستانیەتی ڕۆژئاوایش بەوە جیادەکرێتەوە کە لەسەر پاشماوەی شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانی و مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی بنیات نراوە، بنچینەی زمانی گەلانیشی لاتینییە، جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و باڵادەستی یاسا و فرەیی لە سێبەری کۆمەڵگەی مەدەنیدا و پەیکەری نوێنەرایەتی و ئازادییەکانی تاك سیمای ئەم شارستانیەتەیە)[٥٥].

هانتینگتۆن بێهیوا دەبێت لەوەی کە کولتووری ڕۆژئاوا ببێتە کولتوورێکی جیهانیی، لەجیاتی ئەوە پێشنیاری ململانێی شارستانیەکان دەکات بە سەرکردایەتی ئەمریکا و دەڵێ: (نوێگەری و گەشەی ئابووریی نابنە مایەی ئەوەی کە بەڕۆژئاواییبوون دروست بکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبنە مایەی ئەوەی کە ئەو

[٥٥] د. عبدالعزيز بن عثمان التويجري، الحوار والتمايز، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

گەلانە زۆر تر پەیوەست بن بە کولتووورە ڕەسەنەکانی خۆیانەوە، لەبەر ئەوە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە رۆژئاوا واز لە خەیاڵاتی بەجیهانیبوون بهێنێت، بەڵکو پێویستە گەشە بە هێزی شارستانیەتەکەی و زیندوویێتی و گونجان بدات لە بەرامبەر شارستانییە جیهانییەکانی تردا). ئەمەش پێویستی بە ئەوە هەیە کە رۆژئاوا یەك بگرێت بە سەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وێنەیەکی یەکگرتووی ڕۆژئاوا دروست بکات لە چوارچێوەی کولتوورێکی پێکەوە گونجاو.(٥٦)

بەپێی ئەم بۆچوونانە، بەجیهانیبوون نابێتە هۆی ئارامی و ئاسایشی جیهان، بەڵکو جۆرێك لە ململانێ و ناکۆکی دروست دەکات، لەجیاتی دروستکردنی شوناسێکی جیهانیی، ئێستا بووەتە سەرچاوەیەك بۆ ململانێی نەتەوەکان و شوناسە مەزهەبی و ئاینی و کولتوورییەکان.

چونکە کولتووری رۆژئاوا لە بنچینەدا بریتییە لە خوێندنەوەی ئەویتر لەوێنەی دوژمندا، نەك وەك یەکەیەکی فیکری و کێبەرکێی شارستانی، لەجیاتی ئەوەی رۆژئاوا شوناسێکی جیهانیی دروست بکات، بەڵکو بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانە هەنگاو دەنێت، کە ئەویش گەشەکردنی راسیزم و زۆربوونی رق لە پەنابەران و دروستکردنی وێنەیەکی ناشیرین بۆ گەلە ناڕۆژئاواییەکانە.

لەمبارەوە ئەنتۆنی سمیس دەڵێت: (هەتا ئێستاش ئێمە دوورین لە دروستکردنی نەخشەیەك کە تیایدا وێنەی کولتوورێکی جیهانیی بکێشین).

لەکاتێکدا کە بنیاتنانی نموونەیەکی جیهانیی بۆ شوناس بەرەو شکست هەنگاوی نا، هەروەها لەبەرامبەر هەژموون و کەنارخستنی کولتوورەکانی تر، لە زۆربەی شوێنەکانی تری جیهان ڕابوونێکی نوێی ئاینی و نەتەوەیی سەری هەڵدا، کە ئەویش سەرچاوەی بەشێکی زۆر لە ئەو جەنگ و ناکۆکیانە بوو کە لە چارەکی کۆتایی سەدەی پێشوو ڕوویاندا و سەرەتای ئەم سەدەیەش هەر بەردەوامن.

---

[٥٦] هەمان سەرچاوە، ل٦٨-٦٩.

لەمبارەیەوە hirst و تومبوون دەڵێن: (دەوڵەتی نەتەوەیی لەم سەردەمە نوێیەدا پارێزگاری لە هێزی خۆی دەکات، ئێستا ئاراستەکە لەپێناو گەشەی کۆمەڵە هەرێمایەتییەکاندایە، دەوڵەتە نەتەوەییەکان رۆڵی سەرەکی تیادا دەبینن، نەك سیستمێکی جیهانیی بێت و بەسەر هەموو دەوڵەتاندا دەسەڵاتی بکێشێت)[٥٧].

ئەو هەوڵانەی کە دران لەلایەن وڵاتانی ئەوروپییەوە بۆ دروستکردنی یەکێتیی ئەوروپا بۆ ئەم مەبەستەش چەندان خەون و هیوای گەورەیان لەسەر ئەم یەکگرتنە دانابوو، ئەویش لەپێناو دروستکردنی شوناسێکی یەکگرتووی ئەوروپیدا، بە تایبەتیش لە دوای لێدانی دراوی یۆرۆ بۆ ئەوەی ببێتە هێمایەك بۆ یەکگرتوویی ئابووریی نێوانیان، بەڵام سەرەڕای ئەو هەوڵانە ئێستاش نەتوانراوە زاڵبن بەسەر کۆمەڵێك جیاوازییدا، بەتایبەتیش لەڕووی شوناسەوە، چونکە شوناسە لۆکاڵییەکان ئامادەنین واز لە شوناسی خۆیان بهێنن و تێکەڵ بن بە شوناسی ئەوروپی، بەڵکو هەریەکەیان دەیانەوێت کە شوناسی خۆیان پارێزراو بێت و گەشە بە شوناسە لۆکاڵییەکان بدەن، ئەمەش بەڕوونی لەلای فەڕەنسییەکان و ئەڵمانییەکان و بەریتانییەکان دەبینرێت.

## پاراستنی شووناس و تێڕوانینێك بۆ داهاتوو

شوناس کۆمەڵێك تایبەتمەندییە کە تاکێك جیا دەکاتەوە لە یەکێکی تر، کۆمەڵێك سیمای تایبەتی هەیە کە پێکهێنەری جەوهەری ئەو تاکەیە، لە کۆی ئەو تاکانەش کۆمەڵگەیەك دروست دەبێت کە لە سیما گشتییەکانیدا وێنەی هەموو تاکەکان لەخۆ دەگرێت، ئەمانە نەگۆڕ و چەسپاون، لەسەر ئەم بنەمایەش جیاوازییەکان دەبینرێن و لێرەشەوە شارستانیەتییە جیاوازەکان دروست بوون کە هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە لە کۆمەڵێك سیفاتی گشتیدا هاوبەشن، بەڵام لە ناو ئەو شارستانیانەشدا تایبەتمەندییە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی تاك جیاوازن، واتە هەر

---

[٥٧] بیبانوریس، حكم عالمي ومواطنون عالميون، في كتاب الحكم في عالم يتجه نحو العولمة، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٣.

شارستانیەتێك دەكرێت لە كۆمەڵێك نەتـەوە و نیـشتمانی جیـاواز پێـك هـاتبن كـە هـەر یەكەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

بـەڵام ئـەمڕۆ لـە سـەردەمی بەجیهانیبوونـدا دەبیـنین كـە ئـەم تایبەتمەندییانـە لەبەردەم هەڕەشەی توانەوە و لەناوچووندان، چونكە ئەو فەزا نوێیە كە دروست بـووە لە قازانجی فرەكولتووری و تایبەتمەندیدا نییە، بەڵكو لێرەدا یەك كولتوور هەیە كـە بـە ناوی كولتووری جیهانییەوە خۆی نمایش دەكات و دەیەوێت جیاوازییەكان بكوژێت.

پێـشكەوتنەكانی ئێـستا لەسـەر ئاسـتی جیهـانیی و لۆكـاڵی كۆمـەڵێك پرسـیاری ترسناك دەورووژێنن، كە تایبەتن بە زانینی چارەنووسی كولتوور وەك مەنزومەیـەك لـە بـەها و مەعریفـەی مرۆیـی و رۆحـی، كـە كـار دەكـات لەسـەر بـەمرۆییكردنی مـرۆڤ و تێكەڵكردنی بە كۆمەڵگە یان كۆمەڵێكی نیشتمانی، هەندێكی تری پەیوەنـدی هەیـە بـە زانینی ئەو هەوڵانەی كە هەن بـۆ پەیـداكردنی هـەژموونی كولتوورێـك بەسـەر كۆمـەڵێك كولتووری تردا و خستنە ژێر ركێفی خـۆی، هەنـدێكی سـێهەم پرسـیاری ئـەو شوناسـە جیهانییەیە كە هەڕەشەی دروست كردووە لەسەر مەنزومەی ئـەو بـەها كولتوورییانـەی كە لە ناو هەریەك لە كۆمەڵەكاندا هەیە.(٥٨)

(بەجیهانیبوون كار دەكات لەسەر بەتاڵكردنەوەی شووناسی بە كۆمـەڵ لـە هـەموو جەوهـەرێك بـەرەو هەڵوەشـانەوە و پارچـەبوونی دەبـات، بـۆ ئـەوەی خـەڵك بـەرەو جیهانێكی بێ نیشتمان و بێ دەوڵـەت و بـێ نەتـەوە ببـات. ئەگـەر ئـەوە نـەكات ئـەوا چارەنووسی تووشـبوونە بـە شـەڕێكی نـاوخۆ، هـەر كـاتێكیش ملكـەچ بوویـت بـۆ ئـەو پەراوێزە شارستانییە، ئەوا ئینتما بۆ نیشتمان و نەتەوە و دەوڵەت لەدەست دەدەیت، بەمەش شووناسی كولتووری لە هەموو ناوەڕۆكێك بەتاڵ دەبێتەوە).(٥٩)

(بەجیهانیبوون بەم چەمكە دژایەتییـەكی تـەواوی هەیـە لەگـەڵ بنـەماكانی یاسـای نێودەوڵەتی و لەگەڵ سروشتی پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەكان، هـەروەها دژایەتییـەكی

---

[58] د. محمد مقدادي، بدائل العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٦.

[59] د. محمد عابد الجابری، العولمة والهوية الثقافية، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٣.

تەواوی هەیە لەگەڵ ئابووری و نیشتمانی و سەروەریی نیشتمانی و یاسای جیاوازیی کولتووریی، ئەگەر بەجیهانیبوون بەو ئاڕاستەیەی ئێستا بڕوات کە نەخشەی بۆ کێشراوە، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ ئەگەری هەرەسهێنانی ئارامی و ئاسایشی جیهان، چونکە بەجیهانیبوون بەم ناوەڕۆکەوە لە ڕیشەوە کار لەسەر لێدانی شوناسی کولتووری و شارستانی دەکات و بنەمای پێکەوەژیانی کولتووریی نێوان گەلان هەڵدەتەکێنێت[٦٠].

لە ڕوویەکەوە کە بەجیهانیبوون بەو شێوەیە کار لەسەر سەپاندنی شوناسێکی تایبەتی دەکات و ڕێگە لەبەردەم شوناسە لۆکاڵییەکاندا تەسك دەکاتەوە، لەبەرامبەردا جۆرێك لە کاردانەوە لەلایەن نەتەوە جۆربەجۆرەکانی جیهانەوە ڕوویداوە، کە بەشێك لەو گەلانە لە ناو خودی ڕۆژئاوا خۆیدان، لەم ڕێگەیەوە دەیانەوێت پارێزگاری لە شوناسی خۆیان بکەن و وێنەیەکی نوێ بە شوناسەکەیان بدەن، ئەمەش ئەمڕۆ بووەتە مایەی دروستبوونی شەڕێکی گەرم کە هەردوو ناوەندی کولتووری و سیاسی گرتۆتەوە و زۆر جار دەگاتە ئەو ئاستەی کە شەڕی خوێناویشی لەسەر بەرپا ببێت، لەبەر ئەوە ئێستا گەڕانەوە بۆ شوناس لە هەرکاتێکی تر زیاترە و ئەمەش لە زیندووکردنەوە و ڕابوونی ئاینەکان و شارستانیەتە جیاوازەکاندا بەئاشکرا دەبینرێت، لەبەر ئەوە بەڕۆژئاواییبوون ئێستا زۆرتر لە پاشەکشەدایە لەناو گەلە ناڕۆژئاواییەکاندا و جۆرێکی تر لە شوناس دروست دەبێت کە هەڵگری مۆدێرنیتەیە، بەڵام بە شوناسی لۆکاڵی. هانتینتگۆن دەڵێت (ساڵی نەوەدەکان تەقینەوەی قەیرانی شوناسی گەردوونی بەخۆوە بینی، چونکە سەیری هەرکەسێکت بکردایە پرسیاریان دەکرد (ئێمە کێین؟) (ئینتیمامان بۆ کێیە؟) (ئەی ئەوی تر کێیە؟) ئەمانە پرسیاری ناوەندی و جەوهەری بوون، ئەمەش نەك تەنها لەسەر ئاستی ئەو نەتەوانەی کە دەیانویست دەوڵەتی

---

[٦٠] د. عبدالعزيز بن عثمان التويجري، العالم الاسلامي في عصر العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٩.

نەتــەوەیی نــویێ دابمــەزرێنن، وەك ئــەوەی لــە یوغــسلافیای پێــشوودا هــەبوو، بــەڵكو لەسەرەتاشدا بەشێوەیەكی گشتی جیهان بەو شێوەیە بوو.[٦١]

تەنانەت لە بواری كولتووری و فیكری، سووربوونێكی زۆر هەبوو لەسەر پاراستنی شــوناس و بەرەوڕووبوونــەوەی بــەجیهانیبوونی كلتــووری، ئــەویش بــۆ ئــەوەبوو كــە شێوازێكی تر بدۆزرێتەوە بۆ مامەڵەكردنی بەجیهانیبوون لەگەڵ دەزگاكانی تر.

لەسەر ئاستی وڵاتانی ئەوروپیش چەندان گــەل و نەتــەوەی ئــەوروپی دەبیــنین كــە هەندێك لەمانە لە سنووری یەكێتی ئەوروپادان كار لەسەر ئەوە دەكــەن كــە شــوناس و كولتووری خۆیان بپارێزن و تەنانەت ئامــادەنین لــەناو كولتــووری هاوبەشــی ئەوروپیــدا بتوێنــەوە، هەنــدێك لــە ئەورپییــەكان بــەرەوڕووی ئەوشوناســە دەوەســتنەوە كــە لــە شارستانیەتی ئەمریكیەوە سەرچاوەی گرتــووە و ئەمــە بــەجۆرێك لەغــەز و داگیركــاری لەقەڵەم دەدەن (هوبیرفیدرین) وەزیری دەرەوەی پێشووی فەرەنسا لە كتێبی (رهانات فرنسا فی زمن العولمە) دەڵێت: بەجیهانیبوون بەشــێوەیەكی ئۆتۆمــاتیكی خزمــەت بــە فەڕەنــسا ناكــات، چــونكە لەســەر بنەمایــەك گەشــە دەكــات كــە لەگــەڵ ترادســیۆنی و كولتووری ناگونجێت، بەتایبەتی لە ڕووی ئابووری بازاڕدا و گومان پەیدا كردن لە ڕۆڵی دەوڵــەت، تاكگــەرایی بــێ ئەنــدازە پاڵنــەرێكی میكــانیكی بــۆ ئــەوەی ئــەمریكا ڕۆڵێكــی پێویــست و ببینــێ (هــەموو ئەمانــە لەگــەڵ شوناســی فەرەنــسادا ناگونجێــت، چــونكە شوناســی ئێمــە لــە ڕووی مێژووییــەوە لەســەر بنــەمای دەوڵــەتی ناوەنــدی بــەهێز و پاشــایەتی و دوایــش كۆمــاریی دروســت بــووە، ئــەویش لــەو بیرۆكەیــەوە سەرچــاوەی گرتووە كە پێویستە فەڕەنسا ڕۆڵێكی نەوعی بگێڕێت لە جیهاندا لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و یاسایی، ئەمەش مانای ئەوەیە هەروەك دەڵێت: هەرچی برژێتە ڕووباری هێـز و فیكر و پرۆژە تایبەتییەكانمان بە شوناس، پێویستە بــەرگری لێ بكــەین، ئــەویش لــە ڕێگەی دبلۆماسیەت و جوڵەیەكی بەرگریی نوێوە.[٦٢]

---

[٦١] صمویل هانتینغتون، صدام الحضارات، ترجمة: صلعة الشایب، سەرچاوەی پێشوو.

[٦٢] د. محمد مقدادي، بدائل العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨.

پاراستنی شوناس ئێستا بۆته سیمای گەله زیندووەکانی جیهان، ئەو گەلانەی کە خاوەن شارستانیەت و ترادسیۆن و کەلەپوورێکی مێژوویی دەوڵەمەندن، ئەو گەلانەی خاوەنی ڕەوشت و بەهای باڵای مرۆیین کە دەتوانن لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤی نوێدا پشتی پێ ببەستن، بەشداربن لە گەشەپێدانی شارستانیەتی نوێدا.

ئەم گەلانە کە پشت دەبەستن بە رابردوو ئەو دەوڵەمەندییە فیکری و شارستانییەی کە هەیانە جۆرێك لە ئیرادە و بڕوابەخۆبوونیان بۆ دروست دەبێت، کە بە ڕۆحیەتێکی نوێوە مامەڵە لەگەڵ جیهاندا بکەن.

(ئارسەر ئایداد ئەبل بوم) دەڵێت: (بوونی باکگراوندێکی کولتووریی تایبەتی دەوڵەمەند، مەرجێکی پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ژیانێکی مانادار بژی، چونکە مانایەکی تایبەتی دەدات بەو جیهانە تایبەتییە و شوناسێکی کەسایەتی تەندروستی دەبێت، چونکە کاتێك مرۆڤ کولتوورەکەی لەدەست دەدات، ئەمە پێکرانێکی زۆر مەترسیدارە، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی وێرانبوونی خودی کەسایەتی، واتە بوونی باکگراوندێکی کولتووریی تەندروست یەکێکە لە پێویستییەکانی کەسایەتی، هەروەها پێویستە بۆ بەرجەستەبوونی زۆر سوودی تر یان ئازادییە بەهادارەکان بۆ تاك، لەبەر ئەوە مافە کولتوورییەکان زۆر گرنگن لەسەر مافەکانی تاکەکەس).[٦٣]

ئایا ئەگەر ئەمە تێڕوانین و هەڵوێستەکانی ئەوروپییەکان بێت بۆ پاراستنی شوناس لە کاتێکدا کە ئەوان بەشێکن لە شارستانیەتی رۆژئاوا و کولتوور و ئاینێکی هاوبەشیان هەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەیانەوێت شوناس و کولتووری خۆیان لەگەڵ شوناسی وەك ئەوەی لەجیهانیبووندا هەیە، بتوێتەوە، لەم ڕوانگەوە گەلە نارۆژئاواییەکان بەتایبەتی گەلە مسوڵمانەکان دەبێت هەڵوێستێکی تریان هەبێت و بە دیدێکی ترەوە مامەڵەبکەن، لە خزمەت بنیاتنانی شوناسێکی نوێدا بن کە هەڵگری تایبەتمەندیی نەتەوەکەیان بێت لە ڕووی ئاین و مێژوو کولتوورەوە.

---

[٦٣] أرثر ايداد- ابل بوم، الثقافة والهوية والشرعية في كتاب الحكم في عالم يتجه نحو العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٥.

## چۆن پارێزگاریی لە شوناس دەکەین؟

ئەوەی گومانی تێدا نییە، کە شوناسی کولتووریی بە تایبەتمەندی و پێکهاتە و بنەماکانی، دەبێتە کایەی یەکەم بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی کە زۆربەی ناوچەکانیان گرتووەتەوە، ئەو گۆڕانکارییانە بە پلەی یەکەم روو لە شوناس دەکەن و کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەری هەیە، ئەمەش هەریەکە بە جۆرێك کاری لێدەکرێت و خۆی دادەڕێژێتەوە، کولتوورە لۆکاڵییەکانیان دەتوێنەوە و بەبێ هیچ بەرگرییەك خۆیان دەدەن بەدەستەوە و جارێکی تر ڕەنگڕێژ دەبنەوە بە سیما و پێکهاتەی کولتوورە نوێیەکە کە ناوی کولتووری جیهانییە، یان لەبەرامبەر بە جۆرێك لە جۆرەکان جۆرێك لە چاکسازییان تێدا ڕوو دەدات، بەڵام لەسەر هەمان ریشە و پێکهاتەی شارستانی و ئاینی. ئەو گەلانەی کە خاوەنی شارستانیەتێکی دیار و مێژوویین، لە نێو کایەی بەجیهانیبووندا وا بە ئاسانی ناتوێنەوە، بەڵکو دەیانەوێت شوناسی کولتووری خۆیان بکەنە رەمز و سونبول بۆ مانەوە و جارێکی تر لە شێوازێکی تردا نوێی دەکەنەوە کە بگونجێت لەگەڵ گۆڕانکارییە نوێیەکەدا و لەم حاڵەتەدا جۆرێك لە هەستکردن بە ئیرادەیان بۆ دروست دەبێت، چونکە لەلایەك لەسەر بنەما کولتوورییەکەی خۆی دەمێنێتەوە، لەلایەکی تریش لەگەڵ ڕەوتە جیهانییەکەدا دەڕوات و ناهێڵێت دوابکەوێت لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی شارستانی.

ئاستی تێگەیشتنی گەلان رۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە، چونکە لەگەڵ فراوانبوونی سنوورەکانی ئازادی و بچووکبوونەوەی زەوی بە گوندێك، لەهەمان کاتدا زانیارییەکانی یەکترناسینی گەلان و دەوڵەتان زیاد دەکات، لەبەر ئەوە ئێستا بە ئاسانتر هەست بە ئەو پیلان و بەرنامانە دەکرێت کە دژ بە ئیرادەی تایبەتمەندی و سەربەخۆیی گەلان دادەڕێژێت، ئەو پیلانەی کە ساڵانی پێشوو لەئارادا بوون دژی شوناسی گەلان، ئێستا زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت هەستیان پێ بکرێت و لەبەرامبەردا بەرگری لە دژ دروست بکرێت، رۆژئاوا لەو ڕووەوە زۆر بێبەزەییانە مامەڵە دەکات، کە دەیەوێت سیاسەت و ئابووری و بوارە کۆمەڵایەتی و رۆشنبرییەکەی گەلان بخاتە ژێر بەرداشتی زەبەلاحی

دامودەزگاكانی خۆی لە ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان و ئابووری و سیاسییەكان، لەبەر ئەوە لەم ڕووەوە نابێت ئێمە بە دڵسافی مامەڵە لەگەڵ ئەم جیهانە نوێیەدا بكەین، بەڵكو دەبێت ئێمە بە قووڵیٚ بیر لە ڕۆژئاوا بكەینەوە، لەبەرامبەر ڕۆژهەڵاتناسیدا دەبێت بیر لە ڕۆژئاواناسی بكەینەوە.

ئەوكاتەش دەبێت بزانیت ئایا ئامانجی كولتوور و شوناسی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر كولتوورەكانی تردا چییە؟ ئایا یەكترناسین و فرەكولتووری و لەیەكتر تێگەیشتنە، یان توانەوە و نەهێشتن و بنبڕكردنە؟

شارستانیەت و هەژموونی ڕۆژئاوا ئەمڕۆ بەرەوڕووبوونەوەیەكی گشتگیر و بەردەوامی دروست كردووە بۆ هەموو گەلانی تر، لەڕووی زانستی و سەربازی و سیاسی و تەكنیكی و پیشەسازی و كۆمەڵایەتی و گیانی، لەگەڵ بەردەوامبوونی ئەو سەركەوتنانە و فراوانبوونی بازنەكەی و هەستكردن بە گەورەیی و قەبارەی گەلان زیاتر هەست بە لاوازی و بێهێزی و تەقلید و خۆبەكەمزانی و كەوتنە شوێن سەركەوتوو لە جلوبەرگ و ڕەوشت و هەموو هەڵسوكەوت و بۆچوونێكی تر، زیاد دەكات، ئەمەش دەبێتە سیمایەكی گشتی و تایبەتی و جیاوازییان نابێت،[٦٤] هەروەها بورهان غلیۆن لە بۆچوونێكی تردا دەڵێت: لەدەستدانی متمانە بە كولتووری نەتەوەیی و دووركەوتنەوەی خەڵك لێی و تەسلیمبوون بە كولتووری باو لەوەرگرتنی زانست و ڕەوشت و بنەما ئاراستەكراوەكان لەزۆر شتی تردا، لەم بارودۆخەدا ئاستی شارستانیەت و پێشكەوتنی تاك دەبەسترێتەوە بە شێوازی ڕەوشت و هەڵسوكەوتی ڕۆژئاواییانەوە، ئەو خۆبەكەمزانینەی كە لەو كولتوورانەدا دەبینرێت، لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو كۆمەڵگایانەی كە هەڵگری ئەم كولتوورەن پێگەی جیهانیی خۆیان لەدەست داوە و كاریگەرییان لەسەر دیاریكردنی چارەنووسی مرۆڤایەتی نەماوە، بەڵكو ئێستا هاتووەتە ناو ئەم شارستانیەتە نوێیەوە، بەڵام هیچ هۆكارێكی نییە كە زاڵبێت بەسەریدا، لێرەوە دێت و بەها مرۆییەكان لە كولتوورێكی تر

[٦٤] د. برهان غليون، إغتيال العقل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٦.

وەردەگرێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئەوەوە نییە.[٦٥] بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و سەرکەوتنی وڵاتانی ڕۆژئاوا لە بواری ئابووری و سیاسییدا ئەمە بووەتە هۆی ئـەوەی کە ئەم وڵاتانە، بەردەوام بەدیدێکی باڵاوە مامەڵە لەگـەڵ گـەلانی تـردا بکـەن، دواجـار ئەم دیدە دێتە ناو پەروەردە و کولتوور و تاکێکی خۆبەکەمزان دروست دەبێت، چونکە لە هەرەمی سەرەوەی دەوڵەتەوە ملکەچکردن بووەتە سیمایەکی ئـەم گەلانـە، پاشـان لەم ڕێگەیەشەوە دەکەوێتە ژێر مەرجـە جۆراوجۆرەکـانی ڕۆژئـاوا کـە لـە دواییـدا دێتـە بواری کولتووریش، وا لەقەڵەم دەدەن کە مەرجی پێشکەوتنی ئـەم گەلانـە پەیوەسـتە بە پابەندبوون بە کولتووری ڕۆژئاوا.

(جـاك بـیرك) ڕۆژهەڵاتناسـی گـەورەی فەرەنـسی پرسـیارێکی جەوهـەریی دەوروووژێنێت و دەپرسێت: ئایا ئەزموونی ڕۆژئاوا حەتمی و پێویستە بۆ هەموو گەلان؟ هـەر خـۆی وەڵام دەداتـەوە و دەڵێـت: نـەخێر، نـە پێویـستە و نـە تەواوکـەرە، بـەڵکو زۆرجـار دەبێتـە مایـەی جۆرەهـا شکـست و دڵـەڕاوکێ و هەڵگەڕانـەوە، مێژوونووسـی بـەناوبانگی بـەریتانیش هـەمان هەڵوێـستی هـەبووە.[٦٦] بـۆ ئـەوەی نەتەوەیـەك بـە زیندوویی بمێنێتەوە و لەبەردەم شـاڵاوەکانی بەجیهانیبوونـدا خـۆی ڕابگرێـت، دەبێـت خاوەنی ستراتیژیەتی تایبەتی بێت لـە خۆناسـی و ڕۆژئاواناسـی، ئەمـەش پرۆژەیـەکی گشتگیر بێت لە پەروردە و ئـابووری و سیاسـەتدا و لەبەرنامـەی گەشـەپێداندا ڕەنـگ بداتەوە.

ئەگەر دەتەوێت ئاستی کاریگەربوونت بە ڕۆژئاوا کەمبکەیتەوە و چیتر بـەرەوخۆی کێشت نـەکات، ئـەویش بـەوە دەبێـت کـە بـچینەوە سـنوورە سروشـتییەکەی خـۆی و بەسەر ئەفسانەی کولتووری جیهانیشدا زاڵ بین، چـونکە هـەموو کولتوورێك هەرچـەند بانگەشـەی ئـەوە بکـات کـە جیهانییـە، دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەریی ڕاگەیانـدن، لـە ژینگەیەکی تایبەتیدا گەشـەی کـردووە و تایبەتـە بـە چـاخێکی مێـژوویی و دیـاریکراو،

---

[٦٥] هەمان سەرچاوە، ل١٣٧.

[٦٦] د. نعمان عبدالرزاق السامرائي، دراسات في المعرفة، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.

پاشـان لـه دەرەوەی سـنوورەکانی بڵاوبووەتـەوە، ئـەویش بـە هۆکـاری هـەژموون و هۆکانی پەیوەندیکردن.[٦٧]

ئەمەش بە مانـای دابـڕان لـە ڕۆژئـاوا نایـەت، بـەڵکو پێویـستە لەڕوویـەکی تـرەوە ڕۆژئاواناسی ببێتە ستراتیژیەتێکی کاری ڕووناکبیران، بـۆ ئـەوەی جیـاوازی بکـەین لـە نێوان پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و شارستانیەتی ئێستای جیهان لەگەڵ ئـەوەی کـە پێـی دەوترێت کولتووری پیاوی سپی و ڕۆژئاوا، چونکە لە نێوان شارستانیەت و جیهـانبینی تاکی ڕۆژئاواییدا جیاوازیی زۆر هەیە.

نابێت ئێمە لە ڕۆژئاوا دابڕێین، چونکە ڕۆژئاوا شارستانیەتەکەی کۆمەڵێك داهێنان و دەسکەوتی گەورەی تیایە کە مرۆڤ ناتوانێت لێیان دوور بکەوێتەوە، بە مانایـەکی تـر واتــە ئــەویتری شارســتانی.. ئێمــە پێویــستمان پێیــەتی بـۆ پێشخــستنی بـارودۆخی ئێستامان..

هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر ئێمە وا بیر بکەینەوە کـە گەشـەکردنی منـی شارسـتانی دەبێت لە ڕێگەی دابڕان و وێرانکردنی ئەوی شارستانی دابمەزرێت.[٦٨]

ئەم بۆچوونەش، لـەم بارودۆخـەدا ناچەسـپێت کـە وڵاتـانی باشـووری تێـدا دەژی، لەنێویشیاندا وڵاتانی ئیسلامیی، چونکە بە بوونی ئەم بارودۆخە دواکەوتووە، لـە ڕووی ئــابووری و سیاســی و کۆمەڵایەتییــەوە، هــەرگیز تیایــدا پرۆژەکــانی گەشــەپێدان ناچەسپێت، بەڵکو دەبێت بە بیرکردنەوەیەکی تر و تـاکێکی هوشـیارتر و حکومـەتێکی کاراتر بنیات بنرێت.

ئایا ئێمە چۆن دەتوانین لە بازنەی سەرسامبوونمان بە ڕۆژئاوا دەربچین، لەهـەمان کاتیـشدا بێئاگـا نـەبین لـەو پێگـە سروشـتی و واقیعییـەی کـە ئـەمڕۆ شارسـتانیەتی ڕۆژئاوایی هەیەتی، ئەمەش بە ئـەنجام ناگـات، (تـەنها بـە بـوونی هۆکـاری مـەعریفی و ڕەخنەیی نەبێت کە ئەویش لە خوێندنەوەیەکی قووڵی ئەزموونی شارسـتانی خۆییـەوە

---

[٦٧] د. حسن حنفي، د. جلال العظم، ما العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

[٦٨] محمد محفوظ، الاسلام والغرب والمستقبل، ص٥٨.

هەڵـدەقوڵێت، چـونکە شارسـتانییەتەکانی تـریش لـە ئـەنجامی بـوونی ئـەو جـۆرە خوێندنەوەوە بووە کە بوونـە خـاوەنی ئـەو هۆکـارە مەعریفییـە رەخنەییانـە، ئەمـەش دەبێتە هۆی دەرچوونمان لە سەرسوڕمان بە ئەوانی تر و لایەنگریی پێش وەخت).[69]

لەمبارەیەوە دکتۆر حەسەن حەنەفی دەڵێت: (پاراستنی شوناسـی کولتـووریی لـە مەترسـیەکانی بـەجیهانیبوون لـە ڕێگـەی داخـران بـە سـەر خـود و ڕەتکردنـەوەی بەرامبەردا نابێت، چونکە ئەمە چاککردنی هەڵەیەکە بـە هەڵەیـەکی تـر، کۆی ئـەم دوو هەڵەیـەش ڕاسـت دەرناچـێت، بـەڵکو ئـەوە سـەرەتا بـە سـەرلەنوێ بنیاتنانـەوەی کەلەپووری کۆن دەبێت کە پێکهێنەری سەرەکی کولتووری نیـشتمانییە، چـونکە ئەمـە ڕێگرەکان لادەبات و هۆکـاری پێـشکەوتن ئامـادە دەکـات، هـەر دوو ڕەگەزەکـەش لـە کولتووردا هەن، نابێت ئێمە لە مێژووەوە سەیری ئێستا بکەین، بەڵکو دەبێـت سـەرەتا ئەو زەمەنە بناسین کە تێیدا دەژین پاشـان هەڵوێـستێك بەرامبـەر خۆمـان دەربـڕین و بزانین ئایا ئاستی پێشکەوتنی ئێمە تا چ ئاستێکە و کۆمەڵگەکانمان لە چ بارودۆخێکدا دەژین و ئاستی هوشیاریی مەدەنی و دیموکراسی تا چەندێکە، چونکە بەبێ خودناسی ناتوانین بەرامبەرەکانیش بناسین).

سەرەتا دەبێت سیمای ئەو شوناسە بناسین کـە ئینتمامـان هەیـە بـۆی، هـەروەها ئەو کولتوورەی کە لەسەری بنیات نراوە، چونکە ئێمە دەبێت لە خۆمانەوە دەست پـێ بکەین، هەر لێرەشەوە هەنگاو بنێین بۆ ئایندە و بە پرۆژەی تایبەتییـەوە بێینـەوە بـۆ ژیانی سەردەم.

دەبێت لەوە ئاگادار بین کە باسکردن لـە تایبەتمەنـدی مانـای داخـران و تەقلیـد و لاسـاییکردنەوە و خۆخواردنـەوە و دوورکەوتنـەوە لـە ئـەویتر و تـرس لـە سـەردەم ناگەیەنێت، تایبەتمەندی مانای گرنگیدانە بە خـود پـێش ئـەویتر، بـە کەسـە نزیکـەکان پێش دوورەکان، بەوەی کە هەیە پێش ئەوەی کە دێت، هـەروەك پێـشینانمان کردیـان لـە دامەزرانـدنی زانـستی (اصـول) و بنـچینەکانی ئـایین و بنـەماکانی فیقـه، زانـستی

---

[69] هەمان سەرچاوە، ل٥٧.

تەصــەوف هــەر لــە ســەرەتای ســەدەی یەکــەم پــێش وەرگێــڕان لــە ســەدەی دووەم بنیاتنانی فەلسەفە لە سەدەی سێهەم.(٧٠)

گۆڕان و نوێبوونەوە پێویستی بە پرۆژەی گەشەپێدان هەیە، واتە دەتـوانین بڵـێین کە شوناس دابڕاو نییە لە لایەنەکانی تری ژیان لـە ئـابووری و سیاسـی و کۆمەڵایـەتی، بەڵکو ڕەنگدانەوەی باری ژیانی تاکە لە کۆمەڵگـەدا، هـەر ئەمـەش شـێوە و سـیماکانی شـوناس دیـاری دەکـات، واتــە ژینگــەی تــاك پەیوەنـدی ڕاسـتەوخۆی هەیـە لەسـەر دروستبوونی سیماکانی شوناس.

هەرئــەو ژینگەیەشــە ئــەوەی بــۆ دروســت دەکــات، ئایــا شــانازی بکــات بــە شوناسەکەیەوە یان بە بارێکی گرانی بزانێـت و بـەردەوام هـەوڵی خـۆ لـێ ڕزگـارکردنی بدات؟ لەبەر ئەوە دەبێت شوناس شتێك بێت کە تەعبیر لە واقیع بکات نەك بـە خـەیاڵ لە مێژوودا بژی و تەنها بیر لە رابردوو بکاتــەوە و بیــەوێت شـوناس لـە مێـژوودا بنیـات بنێت و هەر لەسەر ئەو سەروەرییانە بژی کە لە رابردوودا هەن.

لەلایـەکی تریـشەوە نابێـت تەکنـەلۆژیا و پێـشکەوتنی هۆکـانی پەیوەنـدی ببێتـە بەدیلی شوناس، چونکە ئەو هۆکارانە بەرهەمی هەوڵ و کۆششی هەموو مرۆڤایەتین لـە قۆناغـە جیاجیاکـانی ژیانـدا و مـوڵکی نەتــەوە و جوگرافیایـەکی تایبـەتی نـین، بـەڵام کولتوور و شوناس تایبەتمەندییەکی نەتەوەیین و لە مێژووەوە سەرچاوە دەگرێت و لە ئێستا تەعبیر لە ئینتیمای تاك دەکات.

هەموو کۆمەڵێك بۆ ئـەوەی بـەردەوام بێـت و بـە ڕێکـی بـڕوات بـەڕێوە، سـەرەڕای زانست و تەکنەلۆژیا، پێویستی بە مەرجەعیەتێکی رۆحی و رەمزی و ئـەخلاقی هەیـە، کە ئەویش دەبێتە سەرچاوەی پەیوەندی و ئیلهام و یەکخستنی سـۆز و بۆچـوونەکانی دەست دەگرێت بەسەر کاردانەوەکانی و مـەرج دادەنێـت بـۆ تێڕوانینـە گـشتییەکانی و دیدە قووڵەکانی، کولتووریش لە کۆتاییدا هیچ نییە تەنها هۆکارێك نەبێت کە لە ڕێگـەی زنجیرەیەك ئیحاوە کە تیایدا تاك خۆی دەناسێت و لەو ڕێگەیەشەوە ئاشـنا دەبێـت بـە

---

[٧٠] د. حسن حنفي، د. جلال العظم، ما العولمة، ل٥٩.

کۆمەڵەکـــەی و پاشـــان خـــۆی ڕێـــك دەخاتـــەوە لـــە ڕێگـــەی چـــالاکییە ڕۆحـــی و داهێنانەکانیەوە.[(٧١)]

بۆ پاراستنی شوناس پێویستیمان بە کۆمەڵە پێوەرێك هەیـە هـەتا مامەڵـە لەگـەڵ ئـەوی تـری شارسـتانی بکـەین، هـەروەها وەرگێڕانـی ئـەوەی کـە بۆمـان دێـت، نـەك تەقلیدکردنێکی کوێرانە و سەرسوڕمان پێی بەبێ وردبوونەوە.

هەر کۆمەڵێك ئەوەی کە وەری دەگرێت لەم شارسـتانیەتە دەگەڕێتـەوە بـۆ هێـزی ئـەو ڕەگەزانـەی کـە پێکیـان هێنـاوە لـە مـاددی و ڕۆحـی و عـەقڵی، هـەر نەتەوەیـەك بڕوابوون بە خودی تێدا نەمێنێت و لاواز ببێت، ئەوا دەگۆڕێت بۆ شـتێکی بێبایـەخ لـەو شارستانیەتە و وەك بەشێك لە زبڵدانی لێدێت [(٧٢)].

ڕووناکبیری گـەورەی فەرەنـسی دکتـۆر ڕۆجیـە گـارودی وا دەبینێـت کـە یابـان تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوای وەرگرت، بەڵام بەهاکانی ڕۆژئاوای وەرنەگرت لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتای بزاڤی چاکسازیی (ماجی) لە ساڵی (١٨٦٨)ەوە پارێزگـاری لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانیان و پەیوەندییـەکانی بەرهـەمهێنان کـرد، لەگـەڵ پاراسـتنی ئـەو بەهایانە، بەڵام سیـستمی ئـابووریی سـەرمایەداریی گواسـتەوە بـۆ یابـان، لەبـەر ئـەوە ڕژێمـە ئابوورییەکـەی بـووە ڕژێمێکـی سـەرمایەداریی ناشـیرین، ئەمـەش بـووە مایـەی دەسـتگرتن بـە داگیرکـەر و سـەرئەنجامیش شکستی (١٩٤٥) یـان تـووش بـوو، بـەڵام یابانی ئەمڕۆ گۆڕاوە بە سیستمێکی تر، ئێستا بـڕوای بـە هێـزی ئـابووریی هەیـە بـەبێ سیاسەت یان ئیمپریالیزم، ئەمڕۆ ئـەوان لـە ڕوانگەیـەکی کۆمەڵناسـی جیهانییـەوە کـار دەکەن، نەك لەسەر بنەمای زانستی کۆمەڵناسیی دەوڵەت[(٧٣)].

ئەگەر بەشێوەیەکی هوشیارانە مامەڵە بکەین، دەتوانین هەنگاوی ئیجـابی بنـێین و سـەرەتایەکی ڕێنیـسانس دەسـت پێبکـەین، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش پێویـستە هـەموو

---

[٧١] برهان غليون، اغتيال العقل، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٣.

[٧٢] هەمان سەرچاوە، ل٣٦٥.

[٧٣] د. نعمان عبدالرزاق السامرائي، مدخل الى الثقافة الاسلامية، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢.

دامودەزگاكانی دەوڵەت بەشداربن لە ڕاگەیاندن و كولتـوور و پـەروەردە و سیاسـەت و ئابووری و كۆمەڵناسی، ئەم گۆڕانكارییەش دەبێت لەسـەر بنـەمای پرۆژەیـەكی تـەواو بێـت، دەوڵـەتیش بەرپرسـیاری یەكەمـە لـەم كـارەدا، پێویـستە هـەموو هۆكارەكـان بەكاربهێنێت بۆ ئەم مەبەستە لە توانەوە و هەڵوەرین و داڕزان بـەدوور بـێن، گـرنگترین ئەو لایەنانەش كە پێویستە بەشداربن، بریتین لە:

١ـ دامودەزگا ئابوورییە نیشتیمانییەكان، بەتایبەتیش ئەوانەی كە مـاڵی خـەڵكن و هەڵگری شوناسن.

٢ـ پرۆگرامەكانی خوێندن لە دامودەزگا جیاوازەكانی فێركردندا.

٣ـ سەنتەرەكانی توێژینەوەی زانستی، بەتایبەتیش ئەوانەی كە پەیوەندییان هەیە بە دامودەزگا بەرهەمهێنەرەكان و زانكۆكان لە دامودەزگا جۆربەجۆەكانی پەروەردە و فێركردندا.

٤ــ هۆكـانی ڕاگەیانـدنی بینـراو و بیـستراو و خوێنـدراو، لەنێویـشیاندا تـۆڕی ئینتەرنێت.

٥ــ دامودەزگـا كولتوورییـەكان و ڕێكخـراوە جەماوەرییـەكان و دەسـتە سیاسـی و كولتوورییەكان[٧٤].

دكتۆر موحەممەد عابد ئەلجابری دەڵێت: (ئێمە پێویـستمان بـە مـۆدێرنیزم هەیـە، واتە بچینە ناو سەردەمی زانست و كولتوور وەك بەشدار و هاوكارێك، لەهەمان كاتیشدا پێویـستمان بـە بـەرگری هەیـە لەئاسـت هاتنـەناوەوەی فیكـری نـاوخۆ و پاراسـتنی شوناسی نیشتیمانی و تایبەتمەندیی كولتووریمان بۆ ئەوەی لـە توانـەوە و پارچـەبوون بیپارێزین، بەتایبەتیش لە ژێـر كاریگەرییـەكانی شـەپۆلەكانی داگیركـاریی كـە پـەیڕەو دەكرێت لە ئاست ئێمـە و هـەموو جیهانـدا، ئـەویش لـە ڕێگـەی هۆكارەكـانی زانـست و كولتوورەوە، كە ئەمەش پەیوەستە بە گەشەپێدانەوە و پەیوەستە بە شێوازی بەرگری و پاراسـتنی شـوناس و تایبەتمەنـدی بـە پـشتبەستن بـە هۆكـارە بێـسنوورەكانی

---

[٧٤] د. محمد حنفي، الهوية والعولمة.

بەجیهانیبوون، کە بەجیهانیبوون خۆی فەراهەمی هێناوە، واتە پشتبەستن بە لایەنە ئیجابییەکانی بەجیهانیبوون لەپێشەوەی هەمووشیان زانیاری و تەکنەلۆژیا، ئێمە ئەمە بە ئاشکرا لە پلانەکانی وڵاتانی ئەوروپیدا دەبینین، کە زۆربەی کات مەترسییەکانی داگیرکاری ئەمریکی بەبیردەهێنینەوە، بەتایبەتیش لە بواری ڕاگەیاندن و کولتووردا کە ئێستا بووەتە شتێك کە هەڕەشەیە لەسەر کولتوورەکانی تر، ئەمەش لە فیلم و هونەر و نووسراوی ئەکادیمییەکانیاندا دەردەکەوێت بەشێوەیەکی دەستەجەمعی کە پێشکەوتووترین هۆکاری تەکنەلۆژی بەکاردەهێنن، لەوانەش مانگە دەستکردەکان بۆ ئەوەی هەموو بوارەکانی مەعریفی و تایبەتمەندییە کولتوورییەکان بخەنە ژێر باڵی خۆیان.

بەشێوەیەکی گشتی و لەسەر ئاستی جیهان ئێستا دوو گوتاری جیاواز دەبینین بەرامبەر بە کولتوور و شوناس، لەلایەك داوا دەکەن کە گەلە ناڕۆژئاواییەکان دەستبەرداری کولتوورە لۆکاڵییەکان ببن و بۆ ئەم مەبەستەش هەر لە سەردەمی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە هەتا ئێستا لەسەر ئەوە کاردەکەن کە کولتووری ناڕۆژئاوایی کولتوورێکی کۆنەپارێز و دواکەوتووە، پێویستی بە گۆڕان و نوێبوونەوە هەیە و زۆر جاریش بە کولتوورێك لە قەڵەمی دەدەن کە بەردەوام نەفامی و ئیرهاب و توندوتیژی بەرهەم دەهێنێت، لەبەر ئەوە ئێستا دەبینین ئەم گوتارە دژی کولتووری ڕۆژهەڵات بووەتە گوتارێکی جیهانیی و لەناو خودی ڕۆژهەڵاتیشدا ئێستا نەك ڕۆشنبیران و ئەکادیمییەکان، بەڵکو عەوامەکانیش فێری ئەوەبوون کە سەرچاوەی یەکەمی نەهامەتی و دواکەوتوویی و توندڕەوی تەنها دەگەڕێتەوە بۆ کولتووری ڕۆژهەڵاتییەکان، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا وەسفکردنی کولتوورێکی ترە کە پێی دەڵێن ڕۆژئاوایی، بەمەش ئێستا جەنگێکی سەخت دژی کولتووری ڕۆژهەڵات لە گەشەکردندایە.

بەڵام لەبەرامبەردا ئەگەر سەیری ئەوروپا بکەین، دەبینین جۆرێك لە دوالیزمی پێوە دیارە دەربارەی مەسەلەی شوناس، چونکە لەلایەك دەربارەی پاراستنی شوناس

و تایبەتمەندی ئەوروپیبوون دەدوێن، لێرەشەوە ئەمە بە ڕێگەیەك بۆ یەكگرتن و پاراستنی یەكڕیزی دەزانن لە نێوان گەلان و وڵاتانی ئەوروپیدا، ئەویش لە ڕێگەی نەخشەیەكی عەقڵانی لە چوارچێوەی پیادەكردنی دیموكراسیدا، ئەمەش دەتوانین وەك وڵاتانی دنیای سێ كەڵكی لیٚوەربگرین كە چۆن توانیویانە لەگەڵ كولتووره لۆكاڵییەكانیاندا خۆیان بگونجێنن، ئێمە وەك وڵاتانی ئیسلامیی دەتوانین كەڵك لەو تایبەتمەندییە ئەوروپییە وەربگرین و شوناس بكەینە مەرجەعیەتی پرۆژەی شارستانی عەقڵانی و دیموكراسی، لەگەڵ بەشداریكردن و كەڵك وەرگرتن لە ئەوانی تر لە تەكنەلۆژیا و كولتوور و دامودەزگا پێشكەوتووەكان، لەوانەش دیموكراسیەت و دامودەزگاكانی كۆمەڵی مەدەنی، واتە دەبێت جۆرایەتی هاوتەریب بێت لەگەڵ پرۆگرامەكانی پەرەپێداندا، چونكە گرفتی سەرەكی و بنەڕەتی لە جیهانی ئیسلامیدا بریتییە لە دواكەوتن لە هەموو لایەنەكانی ژیاندا، بەڕاستیش كۆمەڵگەی دواكەتوو لاواز لە هەموو لایەنەكانی سیاسی و ئابووری و زانستی ناتوانێت پارێزگاری لە تایبەتمەندییە كولتوورییەكان و كەلەپووره شارستانییەكەی بكات و ناتوانێت بەرگەی ئەو هێرشە كولتووری و ڕاگەیاندنە بگرێت كە ئاڕاستەی دەكرێت لە هەموو لایەكەوە، هەروەها ناتوانێت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش خۆی بگرێت لەبەرامبەر ئەو جەنگە سیاسییە نێودەوڵەتییەی كە بە شەپۆلە پێچاوپێچەكان ئاڕاستە دەكرێت و پارێزگاری لە بەرژەوەندییە ژیانییەكان بكات[٧٥].

لەبەرئەوە ئەگەر دەمانەوێت پارێزگاری لە شوناسی كولتووریمان بكەین، پێویستە بەشداریمان هەبێت لە سەرخستنی پەرەپێدان و ڕێنیسانس، كاركردنمان لەسەر ئەم دوو بوارە زەمانەتی پاراستنی شوناسمان دەكات، واتە دەبێت وێنەی شوناسێك دروست بكەین كە شوناسی سەردەمی كرانەوە و گەشەپێدان و دیموكراسی و كۆمەڵگەی مەدەنییە نەك شوناسی شارستانی لە چاخە مێژووییە ڕابردووەكاندا، بۆ

[٧٥] د. عبدالعزيز بن عثمان التويجري، العالم الاسلامي في عصر العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

ئـەم مەبەسـتەش دەبێـت کۆمەڵگەیـەك بنیـات بنـێین هاوشـێوەی کۆمەڵگـە جیهانییـە پێشکەوتووەکان، هەریەك لەو دەزگایانەش ئەرکی تایبەتی نوێی هەیە، بەم شێوەیە:

١ـ دەبێـت حیزبە سیاسییەکان لەسەر بنەما و هۆشیارییەکی دیموکراسـی دروسـت ببن کە نموونەی چەسپاندنی ئازادی و مافەکانی هاووڵاتی بن لـەناو حیـزب و دەرەوەی حیزبدا، بەمەش گەل هەست بە کەسایەتی و بەهای خـۆی دەکـات و ڕێـز لـە شوناسـی نەتەوەیی خۆی دەگرێت.

٢ــــ ڕۆڵـــی ســـەندیکاکان لـــە پاراســـتنی مـــافی ئەنـــدامیان و پاراســـتنی بەرژەوەندییـــەکانیان و لایـــەنگریکردنیان بـــۆ بەدەســـتهێنانی مافـــەکانیان، بەمـــەش کرێکـاران و فەرمانبـەران و هـەموو چـین و توێـژەکان کـار دەکـەن لەسـەر پاراسـتنی نیشتیمان و خزمـەتکردنی ئامانجـە نەتەوەییـەکان و هەوڵـدان بـۆ پاراسـتنی شوناسـی لۆکاڵی.

٣ـ پێویستە کۆمەڵە کولتوورییەکان کار لەسـەر پێشخستنی کولتـووری نیـشتمانی بکەن و گرنگـی بـە ژیاندنـەوە و گەشـەپێدانی بـەها کۆمەڵایەتییـەکان بـدەن و ڕێـز لـە ئیرادە و ویستی خەڵك بگرن.

٤ــ پێویـستە ڕێکخراوەکـان بـە شـێوەیەکی گـشتی کـار لەسـەر بنیاتنـانی پەروەردەیەکی نیـشتمانی و نەتـەوەیی و ڕەسـەن بکـەن کـە خزمـەت بـە چەسـپاندنی شوناس بکات و ئەو پەروەردەیەش هۆکارێك بێـت بـۆ ڕوانـدنی هەسـتی خۆشەویـستی نەتەوە و نیشتمان و ئایین و شارستانیەتە مێژووییەکەی.

٥ـ پێویستە دەوڵەت گرنگی بە چەسپاندنی دیموکراسی و فراوانکردنـی بوارەکـانی ئازادی و چەسپاندنی مافەکانی هاووڵاتی بدات و خاوەنی پرۆژەیەکی تایبـەتی بێـت لـە بواری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و بەمەش هانی تاك بدات کە شانازی بکـات بـە مێژوو و شارستانیەت و شوناسی نەتەوەیی خۆی.

٦ـ دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسـەر سـتراتیژیەتێکی نیـشتمانی و نەتـەوەیی و ئـاینی کار بکەن و لەگەڵ دەزگاکانی تری پەروەردە و فێرکردن و خێزاندا هەماهـەنگی بکـەن

و به هەموویان خزمەت بە پێگەیاندنی تاکێکی بەهاداری پێشکەوتوو لە ڕووی زانست و هوشیار لە ڕووی ئەخلاق و پەروەردە بکەن.

ئێمە ئێستا لـە جیهـانی ئیـسلامییدا لـە بـارودۆخێکی زۆر سـەختدا دەژیـن لەسـەر هەموو ئاستەکان، هەموو ولآتانی ئەنـدام لـە کـۆنگرەی ئیـسلامیی کـە ژمارەیـان (٥٧) دەوڵەتە بە دەست گرفتی ئابووریی قورسەوە دەنـاڵێنن. هەنـدێکیان، بـەڵکو زۆربـەیان دەکەونــە ژێــرەوەی ئــەو ولآتانــەی کــە لــە ڕاپۆرتــەکانی نەتــەوە یەکگرتووەکانــدا بڵاودەکرێنەوە دەربارەی پەرەپێدانی مرۆیی.[٧٦]

لەبـەر ئـەوەی جیهـانی ئیـسلامیی پێویـستی بـە گۆڕانکـاری هەیـە لەسـەر ئاسـتی دەرەوە و ناوەوە، هەروەها لەسەر ئاستی دەسەڵات و گەلیش، چونکە بەبێ گۆڕانێکی جەوهەریی ئێمە ناتوانین بەشداری لە شارستانیەتی جیهاندا بکەین، بارودۆخی جیهـانی ئیـسلامیی بـارودۆخێکی ناهـەموارە بـە تایبـەتیش لەسـەر ئاسـتی دەسـەڵات، دەبێـت لــەمیانی کرانــەوە و بــواری ئــازادیی زیــاتر، ڕۆژبــەڕۆژ تــاکڕەوی و عەســکەرتاریەت پەرەدەستێنێ و گەندەڵی زیاتر گەشە دەکات و دامودەزگاکـانی دەوڵـەت زیـاتر قـۆرغ دەکرێـت لەلایــەن حزبــی دەســەڵاتدار و بوارەکــانی کــاری ئۆپۆزســیۆن بــەر تەســك دەکرێتەوە و دەزگا ئەمنییەکان بەهێز دەکرێن و زیندانـەکان زیـاتر بـە ڕووی نەیارانـدا والآ دەبێت، لەبەرامبەریشدا دواکەوتوویی و هەژاری پەرە دەسەنێت.

لەبەر ئەوە بەم حاڵەتەوە ئەم گەلانە نە دەتوانن پارێزگاری لە شوناس بکـەن، نـە دەتوانن ببنە سونبولێك بۆ گەشە و نوێبوونەوە.

لــەپێناو بنیاتنــانی پرۆژەیــەکی نــوێ بــۆ گەشــەپێدان و ڕەخــساندنی بوارێـك بـۆ پاراستنی شوناس پێویستە ئەم هەنگاوانە لە جیهانی ئیسلامییدا بنرێن:

١ـ گرنگیدان بە پەروەردە و فێرکردن و نوێبوونەوە و دانانی پرۆگرامێکی نـوێ بـۆ خوێندن و پەیوەستکردنی بە کولتوورەوە، کارکردن بۆ پێگەیاندنی نەتەوەیـەکی نـوێ کە بتوانێت ئەم کۆمەڵگایە بباتە ئاستێکی تر.

---

[٧٦] د. عبدالعزيز بن عثمان التويجري، العالم الاسلامي في عصر العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

٢ـ بـەهێزکردنی پەیوەنـدیی نێـوان وڵاتـانی ئیـسلامیی و قووڵکردنـەوەی گیـانی پێکەوەژیان لە بواری تەکنەلۆژیا و خوێندن و گەشەپێدانی دیموکراسی.

٣. ئەنجامـدانی چاکـسازییەکی گـشتی لـەپێناو بنیاتنـانی دەوڵـەتێکی نـوێ کـە دیموکراسـیەت بـچەسپێنێت و گەشـەی ئـابووری رووبـدات و دەرگـا بکاتـەوە بـە ڕووی ئۆپۆزسیۆن و گەشەپێدانی کۆمەڵگەی مەدەنی هاوچەرخ.

٤. ڕێزگرتن لە مافی کەمینەکان و لە ڕووی مەزهـەب و نەتـەوەیی و گرنگیـدان بـە چەسپاندنی مافەکانی هاووڵاتی و گەشەپێدانی میدیای ئازاد.

گرتنەبەری ئـەم هەنگاوانـە پێکهاتـەی ئـیرادەی تـاك بـەهێز دەکـات و جۆرێـك لـە شـانازی بـە کولتـووری بـۆ دەگەڕێتـەوە و ئـەو کاتـەش دەتوانێـت خـۆی بـە هـەڵگری شوناسـێك بزانێـت و لـە نێـو گۆڕەپـانی جیهانیـشدا هەسـت بـە بـوونی خـۆی بکـات لەبەرامبەر ئەوانی تردا، بەم ڕێگەیەش دەتوانێت شوناس لە توانەوە بپارێزێت.

## بنیاتنانی کولتوورێکی نوێ

تێـڕوانین بـۆ ئاینـدە یەکێکـە لـە پێویـستییەکانی وڵاتـانی ناوچـەکە و گەلـە جیاوازەکان، بۆ ئەوەی بزانن لە چ زەمەنێکدا دەژین و لـە ئاینـدەدا بـە کـوێ دەگـەن، سەرەتا دەبێت تێڕوانین بۆ ئایندە لە تێگەیشتن لە واقیعی ئـەو کۆمەڵگەیـەوە هـەڵقوڵا بێت کە تیایدا دەژین، بـە بـوونی لێکۆڵینەوەیـەکی زانستی سۆسـیۆلۆژیی، کـە تیایـدا خاڵی لاوازی ئەم کۆمەڵگایانە دیاری بکات، دەگەینـە کۆمەڵـە ئـەنجامێك کـە ئـەو کاتـە پێویـستە لەلایـەن کەسـانی پـسپۆڕ و ئـەکادیمی و بـە سەرپەرشـتی دەزگاکـانی لێکۆڵینـەوەی سـتراتیژی و بـە هاوکـاری حکومەتـەکان بـۆ ئـەوەی پـشتیوانی لـەو لێکۆڵینەوانە بکەن و ڕێگەیان بۆ خۆش بکەن بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لـە هـەموو ئـەو دامودەزگایانەی کە پێویستن و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو پێداویستییەکیان بـۆ دابـین بکەن.

ئەمڕۆ دەرگاكانی لەسەر پشتن، بە چاك و خراپیەوە بە ڕووی هەموو گەلاندا كراوەتەوە، ناشتوانرێت كۆنترۆڵی هوشیاری و هەستەكانی تاك بكرێت بە شێوازە تەقلیدییەكان كە دەوڵەت لە رابردوودا پەیڕەوی دەكرد و لە ڕێگەی دامودەزگا جۆربەجۆرەكانیەوە دەیویست كۆنترۆڵی سەرچاوەكانی زانیاری بكات و گەلەكەی لە دنیا دابڕێت، ئێستا مامەڵەكردن لەگەڵ بەجیهانیبووندا ناتوانرێت وەك بڕیارێكی سیاسی یان رێكەوتننامەیەك لەگەڵ كۆمپانیایەكیدا مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، لەم بوارەدا دۆست و دوژمن نییە، بەڵكو جۆری ئەو بەرگرییە ئەنجامەكانی دیاری دەكات كە بەو گەلە دراوە.

ئەگەر سەیری بەجیهانیبوون بكەین پرۆژەیەكی گشتگیری تەواوە بەرەوڕووبوونەكانی بە شێوازی جیاوازە، خاوەنی جۆرەها تۆڕی زانیاری و رێكخراوی نێودەوڵەتی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و كولتوورییە، ئەمانە هەمووی لە جەوهەردا هەڵقولاوی فیكری نیولیبرالییە، كە ئەویش دید و تێڕوانینی رۆژئاواییانەیە بۆ دیاردەكان و هەڵقولاوی شارستانیەتی رۆژئاوایە.

ئەم تێڕوانینەش لە ڕووی كولتوورییەوە یەك ئاڕاستەیە و تەنیا یەك كولتوور و شارستانی دەبینێت كە ئەویش رۆژئاوایە، لە بەرامبەر ئەویتردا نابینایە و بە چاوێكی كەمتر لەوەی خۆی دەبینێت و كار لەسەر لاوازكردن و تواندنەوەیان دەكات و بۆ ئەم مەبەستەش پرۆژەیەكی گشتگیری هەیە.

ئێمە ئێستا هەست بە بوونی ململانێیەك دەكەین، لەبەرامبەر شوناس و كولتوور و شارستانیەتەكانی تردا ڕووبەڕووبوونەوەیەك هەیە، بەڵام پرسیاری جەوهەریی ئەوەیە كە ئێمە چۆن بەرەوڕووی ئەم شەپۆلە نوێیە ببینەوە؟ ئەمڕۆ بەجیهانیبوون بە كۆمەڵێك هۆكار و دید و بۆچوونی نوێوە لەسەر گۆڕەپانی جیهان كار دەكات، هەموو سەرچاوەكانی هێزی لەدەستدایە، بەتایبەتیش خاوەنی هێزێكی مەعریفی زەبەلاحە كە دەستی گرتووە بە سەر هەموو سەرچاوەكانی زانیاری و تەكنەلۆژی و پەیوەندییدا،

ئێستا شۆڕشێکی زانیاری و ژمارەیی هەیە لە هەموو بوارەکاندا کە پشت بە پێشکەوتووترین هۆکاری تەکنەلۆژیی نوێ دەبەستێت.

شۆڕشی زانیاری ئەمڕۆ پرۆژەیەکی جیهانییە، بە جۆرێك کە لە هەوڵی گۆڕینی جوگرافیای جیهاندایە، کردووەتە گوندێك و ڕۆژئاوا و بە تایبەتیش ئەمریکا کوێخای ئەم گوندەیە، ئێستا (١٢٪)ی خەڵکی جیهان دەستیان گرتووە بەسەر زیاتر لە (٩٠٪)ی بازرگانی (ئەمریکا، ئەوروپا، یابان)، یابان بە تەنها دەستی گرتووە بەسەر نزیکەی (٤٤٪)ی هەناردەی جیهان، ئەم ژمارانە لەڕاستیدا بەرئەنجامی شۆڕشی زانیاری و پەیوەندی و تەقینەوەی مەعریفییە، کە ئەمەش هەڕەشەیە لەسەر بەرجەستەکردنی کولتوور.[77]

ئەم واقیعە نوێیە جیهانییە، کە لە گوندی گەردوونیدا بەرجەستە بوون، بووەتە هۆی ئەوەی کە بەرەوڕووبوونەوەیەك لەگەڵ هەموو گەل و نەتەوەکاندا دروست بکات، ئێستا کولتوورەکان زۆربەیان ئاشنابوون بە یەکتر، ژێرخانە کولتوورییە تەقلیدییەکان بە لەرزە کەوتوون و بەرەو هەڵوەشان دەچن.

ئەم کولتوورە نوێیە، بە جۆرەها شێوە خۆی نمایش دەکات، لە شێوەی وێنە و دەزگای نوێدا دەچێتە ناو هەموو ماڵێك و لە بوارەکانی پەروەردە و زانست و ڕاگەیاندن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەردەکەوێت و دەچێتە ناو تۆڕەکانی پەیوەندی لە ڕاگەیاندن و ئینتەرنێت و دەزگا بیستراو و بینراوەکان، بە تایبەتیش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر گەنجان و نەوەی نوێ هەیە.

لێرەوە لەحزەیەك دروست بوو بۆ ئەم گەلانە کە بتوانن لایەنە لاواز و دواکەتووەکانی خۆیان ببینن و بە بەرنامەیەکی نوێوە گۆڕانکاری و چاکسازی ئەنجام بدەن، بتوانن بە عەقڵێکی نوێوە کولتوورێکی نوێ بنیات بنێن کە لەگەڵ ژیانی سەردەمییانەدا بگونجێت، لەلایەك کار لەسەر پێشخستنی بواری تەکنەلۆژی و زانیاری بکەن لەلایەکی تریشەوە ژیانی سیاسییان بە جۆرێکی نوێ ڕێك بخەنەوە کە تیایدا بە

[77] د. عثمان بن طالب، الهوية في مجتمع المعلومات: http://www.jusur.net.

کولتـوورێکی نوێـوە گرنگـی بـە گەشـەپێدانی دیموکراسـی و لیبـوردەیی و کۆمەڵگـەی مـەدەنی بـدەن بـۆ ئـەوەی گـەلانی ئیـسلامیی بـە عەقڵیـەتێکی نوێـوە بەشـداری لـە بنیاتنانی شارستانیەتی جیهانییدا بکـەن، پێویـستە دیـد و تێڕوانینیـان بـۆ کولتـووری ئیسلامیی بگۆڕن، کە لێرەشەوە سەرەتایەك دەبێت بۆ گۆڕان و بنیاتنـانی شوناسـێکی نویێ ئەویش لە ڕێگەی:

**١ـ نوێکردنەوەی پرۆگرامەکانی خوێندن و گەشەپێدانی پەروەردە:**

پێشکەوتن لە بواری زانستدا تەنها بچێت بەڕێوە، بەڵکو بۆ ئەم مەبەسـتە سـەرەتا پێویستمان بـە بەرنامەیـەکی پـەروەردەیی پێـشکەوتوو هەیـە کـە تیایـدا هۆکارەکـانی عەقلانیـەت و بیـنین و بیـستن بـەهێز بکـات، دەزگاکـانی پـەروەردە و فێرکـردن لـەم وڵاتانەدا پێویستیان بە گـۆڕان و نوێبوونـەوە هەیـە بـۆ ئـەوەی لـە ڕووی پـەروەردەوە تاکێکی دڵسۆز و هوشیار و خاوەن بەرنامە لە ژیاندا دروست بێت، لە هـەمان کاتـدا لـە بـواری فێرکردنـدا نەوەیـەکی بەرهەمهێنـەر و داهێنـەر و کاریگـەر دروسـت ببێـت کـە بتوانێت ئاستی گەشەپێدان لە هەموو بوارەکاندا بباتە ئاستێکی تر.

(ئێستا ئێمـە هەسـت دەکـەین لـە نـاوەرۆك و جەوهـەری پرۆگرامـەکانی خوێندنـدا لاوازی و هەژاری و ناتەواوییەك هەیە کـە ناتوانێـت وەڵامـی بـوارە مـەعریفی و زانـستە نوێیەکان بداتەوە، ئەگەر سەرنج بدەین پۆل بە پۆل گـەنجان خوێنـدن تـەواو دەکـەن، بەڵام لەبەرامبەردا هیچ بەرهەمێك نـابینین و نـاتوانن خزمـەت بـە بـواری بەرهـەمهێنانی ماددی و رەمزیی بکەن)[٧٨].

لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە گۆڕانکاری لە پرۆگرامەکانی خوێندنـدا بـە جۆرێـك بێـت، کە بگونجێت لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمدا و ببێتـە پێگەیـەك بـۆ پێکەوەگرێـدانی رەسەنایەتی و هاوچەرخێتی، ئەمەش پێویستە لەسـەر بنـەمای پـرۆژەی گەشـەپێدانی مرۆیی بێت لەسەر ئاستێکی گشتی لە هەریەك لەم وڵاتانەدا.

---

[٧٨] عبدالله بلعزيز، العولمة والهويات الثقافية، العرب والعولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٣.

٢ـ پشتیوانییکردنی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەموو بوارەکانی مەعریفییدا:

ئەم پشتیوانییە سەرەتا دەبێت لە گرنگیدانەوە بێت بە بوارە زانستییەکان و دیاریکردنی بەشێکی زۆری بودجەی حکومەت بۆ ئەم بوارە هەتا لە بواری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستیدا خەرج بکرێت و کەشو هەوایەکی باش بۆ توێژەر و لێکۆڵەرەوان دابین بکرێت لە زانکۆ و پەیمانگا و دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی، بۆ ئەوەی بە تەواوی ژیانی خۆیان تەرخان بکەن، بۆ ئەم بوارەو ئەم بوارە کولتوورییە ئازادەش هاندەرێك بێت بۆ زیاتر گرنگیدان و بیرکردنەوە و توێژینەوە و لێرەشەوە داهێنانکاریی گەشە بکات.[٧٩]

٣ـ گرنگیدان بە چاکسازیی سیاسی:

پێویستە ئەم بارودۆخە سیاسییە ناهەموارەی کە ئێستا لە جیهانی ئیسلامییدا هەیە، گۆڕانی بەسەردا بێت، چونکە هەتا بارودۆخی سیاسیی بەم شێوەی ئێستا بێت، هەرگیز چاوەڕوانی باشتر ناکرێت، ئێستا دیکتاتۆریەت و تاکڕەوی و گەندەڵی باڵیان کێشاوە بەسەر سیستمی سیاسییدا، کە ئەمەش ڕێگرە لە جێبەجێکردنی هەر بەرنامەیەکی کرانەوە و گەشەپێدان لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا، لەبەر ئەوەیش هەموو شتێك دەبێت هوشیاریی سیاسی تاکەکانی ئەم گەلانە زیاد بکرێت بۆ ئەوەی گەل ببێتە سەرچاوەی گۆڕان.

ئەم بارودۆخە بووەتە هۆی لاوازبوونی دیموکراسی و فرەیی و دادگەریی کۆمەڵایەتی، ئێستا لە ڕێگەی سیاسەتێکی ڕەوانەوە ڕێگە گیراوە لە هەموو عەقڵ و توانایەکی داهێنەرانە.

رژێمە سیاسییەکان ئێستا ناوبانگی دیموکراسیەتیشیان شێواندووە، بەتاڵیان کردووەتەوە لە هەموو جەوهەرێکی دیموکراسی، ڕێگەیان گرتووە لەوەی کە تاك بەشداریی سیاسی و چالاکی هەبێت، لە هەڵبژاردنەکانیشدا ناتوانێت بە ئازادی نوێنەری خۆی هەڵبژێرێت و ڕەخنە بگرێت و گۆڕانکاری لە دەسەڵاتدا بکات، بەمەش

[٧٩] د. عبدالعزیز بن عثمان التویجري، العالم الاسلامي في عصر العولمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

دیموكراسیەت تەنها بووەتە هۆكارێك بۆ شەرعیەتدانەوە بەو دەسەڵاتەی كە هەیە، نەك گۆڕانی دەسەڵات، لێرەوە زۆر گرنگە كە شوناس گرێ بدەینەوە بە دیموكراسیەتەوە، چونكە ئێستا شوناس پێكهاتەیەكی گرنگە لە ڕەگەزەكانی بەرژەوەندیی نەتەوەیی، بۆ نموونە سەیری بەهای دیموكراسی و ڕەهەندەكانی و گرنگییەكەی بكە لە نەخشەی بەرژەوەندییەكانی ئەمریكادا، ئێستا دیموكراسیەت بەهایەكی بنچینەییە كە هاوڵاتی ئەمریكی بەكاری دەهێنێت بۆ پێناسەكردنی شوناسەكەی و دیاریكردنی، هەر لەم ڕوانگەیەوە ئیدارەی ئەمریكی چەندان جەنگی دروست كردووە بۆ پاراستنی ئەو بەهایە هەر لەپێناو پاراستنی ئەو شوناسەدا كە مەبەست پێی دیموكراسییە، ئیدارەی ئەمریكا هێزە سەربازییەكانی بە سەر چەندان دەریادا ناردووەتە دەرەوە، ئەمەش تەنها یەكجار نەبوو، بەڵكو چەندان جار ناردوویەتی، بە تایبەتیش لە دەیەی دوایی سەدەی بیست.(٨٠)

لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا ئەمریكا لە ژێر دروشمی پاراستنی دیموكراسی و گەشەپێدانی دیموكراتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەیان هەزار لە سەربازەكانی نارد بۆ عێراق و ئەفغانستان بەناوی دژایەتی دیكتاتۆریەت و بنیاتنانی دیموكراسی و پشتیوانی لە گەلانی چەوساوە و ژێردەستە.

كۆمەڵگە مرۆییەكانی ئێستا چوونە نێو سەدەیەكی تازە كە ئەویش پشتبەستنی هاوبەشە، چاكسازی ئێستا تێگەیشتنەكەی گۆڕاوە، كۆمەڵگە مرۆییەكان چوونە نێو واقیعێكی گەردوونی نوێوە كە ئەویش پێكداچوونی چارەنووس و هاوبەشییە لە مەترسییەكاندا، ئەمەش لە كێشە ئەمنی و ژینگەیی و تەندروستییەكاندا خۆی دەبینێتەوە، سەرەڕای كارەساتە سروشتییەكان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ و گرفت لەدوای

---

[٨٠] مقتدر خان، التحولات العالمية من جغرافيا السياسية الى سياسة الهويات: .www.islamonlin.net

گرفت ئەو واقیعە دەردەخات کە جیهانە کولتوورییەکان و ناوچە جوگرافییەکان چۆن بەیەکدا چوون.[81]

ئەم واقیعە نوێیە بە تەنها لەلایەن گەلێك و نیشتمانێك و تێڕوانینی ئایینێك و بۆچوونێکی ئوسوڵی ناچێت بەڕێوە، لە هەمان کاتدا سیستمێکی شمولی یان داگیرکاری یان عەقڵێکی تاکڕەوی ناتوانێت ڕابەرایەتی ئەم جیهانە نوێیە بکات.

سەردەمی ئەوە تێپەڕی کە لە ڕێگەی عەسکەرتاری و سیستمی ئەمنی دەوڵەتێك بتوانێت دەرگاکانی جیهان بەڕووی خۆیدا دابخات، بەڵکو ئێستا سەردەمی کرانەوەی دەرگاکانە، دەبێت بە عەقڵێکی جیهانییەوە دیاردەکان بخوێندرێتەوە کە بڕوای بە هاوکاری و هاوبەش و پەیڤین هەبێت بۆ ئەوەی لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەشی مرۆڤایەتیدا کار بکرێت، واتە دەبێت ئێمە زمانی هاوبەش و لەیەکترگەیشتن بدۆزینەوە و هاوولاتیانی خۆشمان لەسەر ئەوە گۆش بکەین کە چۆن تاکێکی کراوە و هوشیار و خزمەتگوزار بن و بە ئازادی توانای داهێنان و ئەفراندنیان هەبێت و بتوانن تەعبیر لە بیرورا جیاوازەکانی خۆیان بکەن.

**٤- کرانەوە و تێگەیشتن لە پێداویستییەکانی سەردەم:**

چونکە ئەو زەمەنە تێپەڕی کردووە کە بتەوێت دەرگا بە ڕووی زانیارییەکاندا دابخەی، ئێستا زانیارییەکان لە فەزاوە پەخش دەکرێن و ئامێری تەکنەلۆژی وا داهاتووە، کە کەس ناتوانێت ڕێگە لەوە بگرێت کە تاکێك ئەو زانیاریانەی دەست بکەوێت.

هەر سیستمێکی سیاسی بەو جۆرە مامەڵە بکات ئەوا خۆی و گەلەکەی تووشی پەراوێزبوون دەخات لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ناتوانێت بەرگەی شەپۆلی گۆڕانکاری بگرێت.

[81] الحاجة العالمية للاصلاح، (٢٠٠٧/٥/٢١): www.mokarabat.com.

**٥ـ بەهێزکردنی تاك:**

سەرەڕای پێگەی کۆمەڵایەتی، پێویستە بارودۆخێك بۆ تاك فەراهەم بکەیت کە کەڵك لە زانیاری و زانست و مەعریفەی هەبوو وەربگرێت کە لە ژینگە و سەردەمەکەیدا هەیە ئەویش لەپێناو باشترکردنی بارودۆخی ژیانیدا و بەرزکردنەوەی توانای بۆ ئەوەی بوونی نوێ بسەلمێنێ و ڕێگەی بۆ خۆش ببێت بۆ بنیاتنانی باشترین سیستمی خوێندن و زانست هەتا لەم رێگەوە مەعریفە بە گشتی بکرێت و هەموو هۆکانی جیاکاریی رێگەی لێبگیرێت و تاك لە حاڵەتێکی سلبییەوە بگۆڕێت بۆ حاڵەتێکی ئیجابی، ئەمەش ئەم ئەرکە بۆ تاك جێبەجێ دەکات.[٨٢]

**٦– گرنگیدان بە گەشەپێدانی مرۆیی و دانانی بەرنامە و پرۆژەی جۆراوجۆر:**

هەروەها پێویستە گەشەپێدان پەیوەست بکرێتەوە بە کولتوورەوە و ببێتە سەرچاوەی داهێنان بۆ تاك لەناو کۆمەڵگەدا، بۆ ئەوەی گەشەپێدانی لەگەڵ ویست و ئیرادەی گەلدا بڕوات و تەعبیر لە هەست و ناخی بکات و پشتیوان لە رۆژەکان بکات و پارێزگاری لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا، ئەزموونی یابان ئەزموونێکی سەرکەوتووە لەم بارەیەوە کە توانیویەتی ژیانی کۆمەڵگە بە تەریبی لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و زانست گەشەی پێبدات و پارێزگاری لە کولتووری نەتەوەیی بکات.

**٧ـ گرنیگدان بە بنیاتنانی کۆمەڵگەی مەدەنی:**

ئازادی و فرەڕایی و بۆچوونی جیاواز و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و بنیاتنانی کۆمەڵگەی مەدەنی، بنەمایەکی سەرەکی کۆمەڵگە نوێیەکانە کە بڕوایان بە دیموکراسیەت و مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی هاووڵاتی هەیە، دەبێت میدیای ئازاد ڕەگەزێکی سەرەکی پێکهاتەی دەسەڵاتی سیاسی بێت، کە وەك دەسەڵاتی چوارەم سەیر دەکرێت و ئێستا لە زۆر وڵاتی رۆژئاواییشدا بووەتە دەسەڵاتی یەکەم و چاودێری سەرەکی دەسەڵاتی جێبەجێکردنە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە پارێزگاری لە مافەکانی تاك بکرێت بە شێوازێکی مەدەنی و یاسایی.

---

[٨٢] برهان غليون، إغتيال العقل، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٦.

پێویسته ژیان بگەڕێنینەوە بۆ شێوازی مەدەنی و ئەهلی، ئەوەش بۆچوونێکی هەڵەیە کە دەڵێت بنیاتنانی دامودەزگا نوێیەکان دەبێتە هۆی لەناوبردنی دەزگا تەقلیدییەکان، وا بزانی تەنها بە ئەمان دەزگا تەقلیدییەکانی کۆمەڵگە پێش دەکەون و بەرەو کرانەوە دەڕۆن، چونکە ئێمە ئێستا دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان دەبینین بە دامودەزگایەکی مۆدێرن دیکتاتۆری دەکەن، لە ڕووی زانست و پێشکەوتنیشەوە، ئەم وڵاتانە تەنها ڕوویان لە دواکەوتوویی و هەژاری کردووە، لەبەر ئەوە بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە پێویسته ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی چالاك بکرێن و بەرپرسیارێتییان دیاری بکرێت و ئەوانیش لە ڕێگەی خۆیانەوە خزمەت بە گەشەپێدانی کۆمەڵگە بکەن.

پێویسته کۆمەڵگە مسوڵمانەکان، ئاگایان لە پاراستنی ڕەسەنایەتی و بەهاکانی ئیسلام بێت، چونکە ئەم گەلانە ئاین تێکەڵ بە کولتوور و شارستانیەت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بووە، لەبەر ئەوە لەکاتی باسکردن لە نوێگەری و گەشەپێداندا نابێت ئیسلام پشتگوێ بخرێت، چونکە کاتێك باس لە گەشە و پێشخستنی گەلێك دەکەیت لە ڕووی شارستانییەوە، دەبێت لە ڕێگەی بەهێزکردنی ئیرادەی هەستکردن بە ئیرادە و پاشخانە شارستانیەتەکەی بێت.

لەبەر ئەوە دەبێت بۆ ئەم مەبەستە کار لەسەر بەرجەستەکردنی جیهانبینی و بەها و بنەما گشتییەکان بکرێت لە کاروانی شارستانی و مەدەنی و ڕێنیسانسدا، چونکە یەکەمین مەرجی بەرەوپێشچوون و گۆڕان و چاکسازیی، گەڕانەوەیە بۆ خود، لێرەوە دەبێت پرۆژەی هەستانەوە و هەنگاو بۆ نوێبوونەوە بنرێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەم بنەمایە نەبێت، ئەوا هەر پرۆژە و هەوڵێك خزمەت بە ئایدیا و جیهانبینییەکی تر دەکات و لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی شارستانیشدا دەبێتە پەراوێزی کولتوورێکی تر.

# سەرچاوەکان:

١- تقي الدين، سليمان: تحوبات المجتمع والسياسة، أفكار عن عالم جديد، دار الحداثة، بيروت، ١٩٩٢.

٢- الجابري، د. محمد عابد: المسألة الثقافية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٤.

٣- العظم، د. جلال، حنفي، د. حسن: ماالعولمة ؟ دار الفكر، دمشق، ٢٠٠٠.

٤- مجموعة المؤلفين: ندوة العرب والعولمة، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧.

٥- أباه، د. السيد ولد: اتجاهات العولمة، المركز الثقافي العربي، دار البيضاء، ٢٠٠١.

٦- هاني، ادريس: المفارقة والمعانقة، رؤية نقدية في مسارات العولمة وحوار الحضارات، مركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠١.

٧- يسين، السيد: إعادة اقتراع السياسة من الحداثة إلى العولمة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠٦.

٨- محفوظ، محمد: الإسلام والغرب، حوار المستقبل، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٨.

٩- المنير، محمود سمير: العولمة وعالم بلا هوية، دار الكلمة للنشر والتوزيع - المنصورة، ٢٠٠٠.

١٠- التويجري، د. عبد العزيز عثمان: العالم الإسلامي في العصر العولمة، دار الشروق، القاهرة، ٢٠٠٤.

١١- عمارة، د. محمد: الحضارات العالمية تدافع أم صراع؟ في التنوير الإسلامي، ٢٤، دار نهضة مصر، القاهرة، ١٩٩٨.

١٢- عبد الهادي، د. حسين: العولمة النيوليبرالية وخيارات المستقبل، مركز الراية للتنمية الفكرية، جدة، ٢٠٠٤.

١٣- عبد الحميد، د. محسن: العولمة من المنظور الإسلامي، مطبعة زيان، أربيل، ٢٠٠٢.

١٤- يسين، السيد: العالمية والعولمة، دار نهضة مصر، قاهرة، ٢٠٠٠.

١٥- مجموعة المؤلفين: ندوة اشكالية العلاقة مع الغرب، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧.

١٦- مجموعة المؤلفين: الحكم في عالم يتجه نحو العولمة، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٢.

١٧- الجابري، د. محمد عابد: قضايا في الفكر المعاصر، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٩٧.

١٨- التويجري، د. عبدالعزيز عثمان: الحوار من أجل التعايش، دار الشروق، القاهرة، ١٩٩٨.

١٩- هنتنجتون، صموئيل: صدام الحضارات، اعادة صنع النظام العالمي، ترجمة: طلعت الشايب، دار الكتاب، القاهرة، ١٩٩٩.

٢٠- مقدادي، د. محمد: العولمة رقاب كثيرة وسيف واحد، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ٢٠٠٠.

٢١- غليون، د. برهان: اغتيال العقل، المؤسسة العربية للدراسات، بيروت، دون ذكر سنة الطبع.

٢٢- السامرائي، د. نعمان عبد الرزاق: مدخل الى الثقافة الإسلامية، مطبعة انوار الدجلة، بغداد، ٢٠٠٣.

٢٣- بلقريز، عبدالإله: في البدء كانت الثقافة، افريقيا الشرق، المغرب، ١٩٩٨.

٢٤- بايار، جان فرانسو، أوهام الهوية، ترجمة حليم طوسون، دار العالم الثالث، القاهرة، ١٩٨٨.

**سەرچاوە فارسییەکان:**

١- شرفی، محمد رضا: جوان وبحران هويت، أنتشارات سروش، تهران.

٢- محمدی، احمد كل: جهانی شدن، فرهنك، هويت، انتشارات نشونی، تهران، ١٣٨٣.

**گۆڤارەکان:**

١. البغدادي، د. احمد: أزمة الفكر الإسلامي في عصر العولمة، النهج، ع/٢٩/شتاء/٢٠٠٢.

٢. جمال الطاهر: الهوية الثقافية في العالم الإسلامي، قضايا دولية، ع/٢٢٧ ٨مايو/١٩٩٤.

٣. د. عمار طالبي: العولمة وأثرها على السلوكيات والأخلاق، الرائد، تصدر على الدار الإسلامية للإعلام بالمانيا، ع/٢٣٦، مايو ٢٠٠٢.

٤. حجازي، د. أحمد مجدي: العولمة وتهميش الثقافة الوطنية، عالم الفكر، م./٢٨، ع/٢/اكتوبر/١٩٩٩.

٥. ابراهيم، حيدر: العولمة وجدال الهوية الثقافية، عالم الفكر م/٢٨/ع/٢٠٠٣.

**سایتەکانی ئینتەرنێت:**

١- هاني نسيرة: مفهوم الهوية بين الثبات والتحول:

http: //www. islamonline. net/arabic/mafaheem/arts/

٢- محمد حنفي: الهوية والعولمة:

http: //www. mokarabat. com/s٧٩٧. htm

٣- خلف بشير: سؤال الهوية وصدمة العولمة:

http: /www. diwanarab. com/spip. php?auteur٨٠٠

٤- خمسي عبداللطيف: الهوية الثقافية بين الخصوصية وخطاب العولمة الهيمني:

http ://www. fikrwanakd. aljabriabed. net/n٤-o٤khomsi. htm

٥- د. عثمان بن طالب: الهوية في مجتمع المعلومات:

http: //www. jusur. net/fekr. wez. htm.
٦- مقتدر خان: التحولات العالمية.. من جغرافيا السياسية إلى سياسة الهويات:
HTTP: /WWW. ISLAMONLIN. NET/IOL-ARABIC/DOWALIA/٩POLITIC-APRIL/٢٠٠٠/٩P٠LITIC١٤. ACP
٧- محمد حنفي: الهوية والعولمة:
http: //www. mokarabat. com/s٧٩٧. htm
٨- ابراهيم جاد الله: الثقافة العربية بين الخصوصية الكونية:
http//: www. rezgar. com/masp٣i=١٤٧٠

# پێڕست

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الکلیات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێـژەرەوەکانی زانکـۆ و بنکـەکانی توێژینـەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکـر و مەعریفە.

هــەروەها پــەیمانگا چــەند نووســینگە و لقێکــی لــە پایتــەختی وڵاتــە عــەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خـۆی ئـەنجام دەدات، هـەروەها چـەند ڕێکەوتننامەیـەکی لەگـەڵ ژمارەیـەک زانکـۆی عـەرەبی و ئیـسلامیی و خۆرئـاوایی لـە سەرانـسەری جیهانـدا بـۆ هاوکـاریی زانـستی هاوبەش، هەیە.